ناوی کتێب: بەندایەتی بۆ خودا

نوسەر و ئامادەکار: بەختەوەر شێخ عەباس

پێداچونەوەی: دابان میران

بابەت: گەشەپێدانی ئاینی

هەڵەچنی و ڕێزمانی: نوسەر

دیزاینی ناوەڕۆک: پێشەوا شێخ ڕەئووف

دیزاینی بەرگ: ئیبراهیم ساڵح

چاپ: چاپخانەی چوارچرا

Baxtawar Shex Abas

Baxtawar_Shex_ Abas

الحمدلله، نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا، وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسول.

# ئەم کتێبە پێشکەشە بە خۆم

جوانترین دیاری لای من کتێبە، بەڵام بەهۆی پیشەکەمەوە کە کتێبفرۆشییە تاوەکو ئەم کاتە هەرگیز کتێبم بە دیاری بۆ نەهاتووە، بۆیە یەکەم کتێب دەکەم بە دیاری خۆم، تۆی ئازیزیش ئەم کتێبە بکە بە دیاری ئازیزێکت.

## پێڕست

پێشەكی

پێش هەموو شتێک دەبێت ئێمە لەوەبگەین کە خالقێکمان هەیە، کە ئەم خالقەش خاوەنی دەسەڵات و قودرەتێکە کە هیچ هێزێک ناتوانێت بەرەنگاری ببێتەوە. ئێمەش وەکو تاکێکی موسڵمان باوەڕمان بەم خودایە هەیە کە لە هیچ نەبووە و هیچ هاوەڵ و شەریکێکی بۆ خۆی دانەناوە، مەبەست لە دروستکردنی ئێمەش، (وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ) واتە: (من جنۆکە و مرۆڤم دروست نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێ کە بە تاک و تەنها من بپەرستن و ملکەچی فەرمانی من بن) ئێمە هەموومان خودا کات و تەمەنێکی دیاریکراوی بۆ ئامادە کردووین، لەم ژیانە کورتەدا، (قُلْ مَتَاعُ الدُّنْيَا قَلِيلٌ) واتە: ئەی محەمەد (صلى الله عليه وسلم) پێیان بفەرموو: (ژیانی دونیا کورتە) کەوایە ئێمە وەک موسڵمانێک باوەڕمان دەبێت وابێت، کە ژیانمان کورتە و دیاریکراووە. کەوایە بۆ لەم ژیانە کورتەدا هەوڵی ڕازی کردنی خودا نەدەین، با پێکەوە ببین بە بانگخوازی خودا، پێکەوە نەهی لە خراپە و کردنی چاکە بکەین، بابین بە بانگخوازی ئەم ئیسلامە و سەری بخەین، بە گەیاندنی پەیامە ڕاستەکان بە خەڵکی وەکو خۆی چونکە بانگخواز تەنها گەیەنەرە نەوەک دروستکەر و خالق، ئێمەش بە

پشتیوانی خودای گەورە ئەوەندەی لە توانای ئێمە دابێت دەیکەینە گەڕ بۆ خزمەت کردنی ئەم دینە پیرۆزە، کە بەڵێنی خودایە داهاتوو بۆ ئیسلامە. ئەم کتێبە لە چەند گەوهەرێکی پرشنگدار پێک هاتووە، کە هۆکاری ڕازاندنەوەی دڵ و دەرونە. ئەم کتێبە پێکنەهاتووە لە یەک بابەت، بەڵکو لە چەندین بابەت پێکمانهێناوە، وە وڵامی بابەتەمانیشمان بە شێوەیەکی کورت و پوخت داوەتەوە، چونکە بابەتەکانمان تایبەت نیە بە یەک بابەت، لە هەر بابەتێکیش بانگەشە کردنی خەڵکیە بۆ یەکتاپەرستی و پێکهێنانی جیلێکی تەوحیت و بۆ باشتر هەڵسوکەوتمان لەگەڵ کۆمەڵگە و ژیانماندا، ئێمە لێرەدا باسی بۆ دروست بووین، چۆن خودا بپەرستین، چی بکەین، بۆ سوپاسی خودا بکەین. بۆ هەموو بابەتەکان ئایەت و فەرموودە شیرینەکانمان بەکارهێناوە، کۆی فەرموودەکانیش لە دوایی گەڕانێکی زۆر و پێداچوونەوەی کەسانی شارەزا لێیان پاشان دامان ناوە. سەرجەم بابەتەکانیش تۆی خۆشەویست ئاشنا دەکات بەوەی بۆچی شکوری خودا بکەیت. کۆی بابەتەکان تەنها بە پشتیوانی پەروەردگار ئامادەم کردووە، پاشان بە توانای خۆم، بەڵام دڵنیام لەوەی بەبێ پەروەردگارم نەم دەتوانی یەک وشەش

بنوسم و مانای ڕستەیەکیش بدەم بە دەستەوە، لەم کتێبەدا ئێمە گرنگیەکی باشمان بە بابەتی تاقیکردنەوە داوە، کە خودا هەمووومان تاقیدەکاتەوە و پاداشت لەسەر ئەم تاقیکردنەوانە وەردەگرین، کە تاقیکردنەوەش لەسەر هەموو پێغەمبەرەکان بووە و باسی هەندێ لەو تاقیکردنەوانەشمان کردووە. من ئەم کتێبەم بە زمانێکی زۆر سادە و وشەی گونجاو بڵاوکردۆتەوە، بۆ ئەوەی سەرجەم تەمەنەکان بە گەورە و بچووک سوودی لێ ببینن، بتوانن بە ئاسانی لێی بگەن. بەو هیوایەم ببێتە توێشویەک بۆ قیامەتی من و دەسپێکی ژیانێکی باشتر بۆ ئەوانەی دەیخوێننەوە، هیوام وایە بە چەند پەڕە جوانەکانم کە ئامادەم کردووە بۆ خوێنەران سوودی دونیایی و قیامەتی لێ ببینن.

بەختەوەر شێخ عەباس

# نوسینی کتێبەکەم

تەمەنم ١٨ ساڵان بوو، کاتێک ئەم کتێبەم نوسیی، لە دوای پێداچوونەوەیەکي تر  لە تەمەنی ٢٠ ساڵی کتێبەکەم بە چاپ گەیاند، ساڵێک بەر لەوەی بیرۆکەی نوسینی ئەم کتێبەم بۆ بێت، کە ١٧ ساڵانم دەکات، کەسێک بووم نەم دەزانی بۆ دروست بووین؟ خالقمان کێیە؟ نەم دەزانی بۆ نوێژبکەم؟ ئایە سوودی نوێژ چیە؟  نەم دەزانی مەبەست لە دروست بوونی من چیە؟ هەمیشە ئەو پسیارانە لە خەیاڵ و مێشکمدا بوو، بەڵام دوای ئەوەی پەروەردگارم چەن دیمەن و تاقیکردنوەیەکی پیشانمدا کە بوونە سەبەب، بۆ ئەوەی بگەڕێم بە دوای دینەکەمدا و بزانم بۆ دروست بوومە، کاتێک کە نوێژم نەدەکرد خەڵکی هەر پێمیان دەوت نوێژ بکە، نوێژ بکە، بەڵام پێمیان نەدەوت بۆ ئەوە بیکە!!! وتنیان هیچ کاری لە من نەدەکرد، تاوەکو خودای گەورە سەبەبێک لەو سەبەبانەی بۆمی نارد و دیمەنێکی پیشانمدا، ئەویش ئەوە بوو کە دایە گەورەمان واتە نەنکی دایکم، کە ڕەزیلی سەرجێگابوو! نەخۆشی درێژخایەنی هەبوو! بە چەند کەسێکەوە هەڵیان دەگرت بۆ ئەوەی دەستنوێژ بگرێت، بەو حاڵەوە نوێژی دەکرد! منیش بە لەشێکی ساغەوە نوێژم نەدەکرد، کە ئەو دیمەنانە بوونە هۆکاری ئەوەی بەخۆمدا بچمەوە و

ژیانێکی نوێ دەسپێ بکەم، کە هەڵەیەکی زۆر لە ژیانمدا بوو، شارەزاییەکی وام نەبوو لە دیندا، پاشان لە دوایی ئەوەی دەستم کرد بە نوێژ، تەواوی ژیانم گۆڕا!!! هەر لە هەڵسوکەوتمدا و مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکیدا و ئەتەکێتی قسە کردنمدا و باشبوونی پەیوەندیم لەگەڵ خوادا و شوێنکەوتەی ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بکەوم و دڵ و دەروونێکی زۆر فراوان و خۆشترم هەبێت، ئەمەش چۆن دەست دەکەوێت؟ تەنها بە شوێنکەوتنی ئەم ئیسلامە. هەمیشە سوپاسی پەروەردگارم دەکەم، کە کار ئاسانی زۆری بۆ کردووم لە تەواوی ژیانمدا و هەر شتێک کە داوام کربێت بۆمی ئاسان کردووە. منیش وەکو سوپاس گوزارێک بۆ پەروەرێنم ئەم کتێبەم پێشکەش کردووە. خوێنەری خۆشەویست ئەم کتێبەی دەیخوێنیتەوە بەرهەمی چەندەها شەو و ڕۆژمە کە بە لە کات گرتنی زۆری لە ژیانم نوسیومە، سەرجەمیان کاریان لە خۆم کردووە، بۆیە لێرەدا ئامادەم کردووە، داواکارم لە پەروەرێنم وەک چۆن سوودم لە سەرجەم ئەو چیرۆک و باسانەی کە باسم کردوونە من بینیومە بەهەمان شێوە ئێوەش ببینن. (إن شاء الله) گەر پەروەرێنم ویستی لێبێت، بەرگی دووی ئەم کتێبە یاخود هەوڵی نوسینی کتێبی کە دەیەم، بە ئیزنی خودام.

## سەرەتای دروستبوونی زەوی و پەرستن

خودای گەورە بڕیاریدا گەردونێکی گەورە دروست بکات، کە هەرگیز هیچ شتێک ناتوانێت دروستی بکات، بەتەنها خۆی توانی بیکاتە ڕاستی و بەدیبهێنێت. هەروەها ڕووەکی سروشتی و گیانلەبەری سەرەتای لێی دروست کرد. پاشان خودا ویستی جێنشینێک بۆ خۆی لەسەر زەوی دروست بکان، کە ئەویش مرۆڤ بوو، بۆ پەرستن و ستایشی خۆی، و لە ڕوحی خۆی فوی پێدا کرد. خودا ویستی بە کۆمەڵ ئەو مرۆڤانەی کە لەسەر زەوین، بەتەنها یەک خودا بپەرستن، کە ئەویش خۆیەتی بۆ پەرستنی خۆی. خودای گەورە ١٢٤ هەزار پێغەمبەری نارد تا بتوانن جیهانێکی تەواو دروست بکەن کە پڕبێت لە خۆشی و خۆشبەختی و بەختەوەری بۆ تەواوی زیندەوەران. ئەگەر بە شێوازێکی زانستیانە بیربکەینەوە کە چی هەیە لەم دونیایەدا کە تیایدا دەژین، ئەستێرەیەک هەیە لەم گردونەدا، گەر بیکەینە ٢٧١ بەشەوە ٢٧٠ بەشی لابدەین ١ بەش بمێنێتەوە ئەو بەشەش بکەینە ١ ملوێن بەشەوە ١ بەش لەو ١ ملوێنە ئینجا بە قەدەر خۆر دەبێت. خۆریش ٣٣٥ هەزار جار لە زەوی گەورەترە. چەندین

کەس هەیە ئەمە دەکەنە قاڵبی دروستکردنی مرۆڤەوە یان پەیکەرێک یان ئاژەلێک، وەک لە وڵاتی هندستان باوە، بە خودای خۆیانی دەزانن، گەورەترین زوڵمێکە کە مرۆڤ بەرامبەر خودای دەکات، پەرستنی مەخڵوقێکە وەکو خۆی. ئێستا با بە بیرێکی فراوان بیربکەینەوە! بۆ نمونە پەیکەرێک کە مرۆڤ خۆی دروستی بکات، ئەمە چ سودێک دەگەیەنێت، کە بشکێت بە قورٍ چاکی دەکەنەوە یان ئاژەڵێک کە توانای بەخێوکردنی خۆی نیە و توانای قسە کردنی نیە، بووەتە زەلیلی مرۆڤ. مرۆڤیش کە لە سالێکدا چەندین شەو خەوی لێناکەوێت، لەتاو ئازار و بێتاقەتی کە توانای چارەسەری خۆی نیە خۆی چارە بکات. ئەم کەونە بە مرۆڤێک دروست دەکرێت! کە تەمەنی ئێستای لە ٦٠ بۆ ٧٠ تێناپەڕێ بەڕاستی ئەقڵی مرۆڤ زۆر گەورەیە لەوەی کە بەم شێوەیە بەکاری بێنێت.

# پاراستنی قورئان

دینی ئیسلام ئاسانكاری زۆری كردووە، بۆ ئەوەی ژیانێک بژین بە خۆشەویستی و بەختەوەری. خودای گەورە كە قورئانی دابەزاندوە، گەر پرسیارێک بكەین، كە پێش هەزاران ساڵ ئەم كتێبە هاتوە (مەبەستمان قورئانە) ئەم پرسیارە بكەین، بلێین ئەم كتێبە لەم ماوەیەی كە هەیە و لە بەردەستی مرۆڤدایە، ئایا ڕستەیەک دەسكاری كراوە! بێگومان نەخێر. نەک ڕستەیەک نەک وشەیەک نەک پیتێک تەنانەت هەمزە و فەتحەیەک دەسكاری نەكراوە. باشە با جوان بیربكەینەوە كتێبێک لەم هەموو شەڕی جیهان و داگیركردنی وڵات و ئاژاوە و بەرهەڵستی و ڕووداوە سروشتیەكان، ئەم كتێبە دەسكاری نەكراوە، با بلێین بۆ! چونكە خودایەكی لە پشتە، كە ئەم كتێبەی پاراستوە. ئەمە تەنها یەكێكە لە موعجیزەكانی خودای گەورە ئەمە تەنها باسی ئەم كتێبەمان كردووە كە قورئانە بەڵام هێشتا باسی موعجیزە و نوسینی ئەم قورئانەمان نەكردووە، كە ئەم قورئانە پێش زیاتر لە ١٤٠٠ ساڵ پێش ئێستا خودای گەورە بۆ كەسێكی هەژار و بەبێ دایک و باوک و نەخوێندەواری دابەزاند، كە ئەویش پێغەمبەر

محمد (صلى الله عليه وسلم) بوو. بەڵگەش بۆ ئەمە لە قورئانی پیرۆزدا خودای گەورە دەفەرموویێت: (وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ ۚ فَالَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يُؤْمِنُونَ بِهِ ۖ وَمِنْ هَٰؤُلَاءِ مَن يُؤْمِنُ بِهِ ۚ وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلَّا الْكَافِرُونَ) (العنكبوت ٤٧) (وَكَذَٰلِكَ أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ) ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) چۆن کتابمان بۆ پێغەمبەرانی پێش تۆ دابەزاندووە، هەروەها بەم شێوازە ئەو قورئانەمان بۆ تۆ دابەزاندووە، (فَالَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ) ئەوانەی کە کتابمان پێ بەخشیوون و ئەهلی کتابن، (يُؤْمِنُونَ بِهِ) ئەوانە ئیمانی پێ دێنن وەک (عبداللەی کوڕی سەلام و سەلمانی فارسی) و ئەوانەی تر کە موسڵمان بوون، (وَمِنْ هَٰؤُلَاءِ مَنْ يُؤْمِنُ بِهِ) لە خەڵکی مەککەش هەیانە موسڵمان بووە و ئیمانی پێ هێناوە، (وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلَّا الْكَافِرُونَ) هیچ کەسێک نییە نکوڵی لە ئایەتەکانی ئێمە بکات، تەنها کافران و بێباوەڕان نەبێ. (وَمَا كُنتَ تَتْلُو مِن قَبْلِهِ مِن كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ ۖ إِذًا لَّارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ) (العنكبوت ٤٨) (وَمَا كُنْتَ تَتْلُو مِنْ قَبْلِهِ مِنْ كِتَابٍ) ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) تۆ پێش قورئان هیچ کتێبێکی ترت نەخوێندۆتەوە (وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ) بەدەستی خۆتیش هیچت نەنووسیوە، بەڵکو نوسەری هەبووە وەحی و نامەیان بۆ

نوسیوە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) نەخوێندەوار بووە و لەناو قورەیشدا ژیاوە و ئەم شتە لەلایان زانراوە (إِذًا لَارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ) ئەگەر خوێندەوار بوایە! ئەوا ئەوانەی کە لەسەر باتڵن گومانیان بۆ دروست دەبوو دەیانووت: ئەم قورئانە محمد (ﷺ) خۆی هێناویێتی. (بَلْ هُوَ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ فِي صُدُورِ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ ۚ وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلَّا الظَّالِمُونَ) (العنكبوت ٤٩) (بَلْ هُوَ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ) بەڵکو ئەم قورئانە پیرۆزە کۆمەڵێک ئایەتی ڕوون و ئاشکرایە (فِي صُدُورِ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ) لە سینگی ئەو کەسانەی کە زانان لە هاوەڵان و جگە لەوان ئەوانەی کە لەبەریان کردووە (وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلَّا الظَّالِمُونَ (٤٩)) وە هیچ کەسێک ئایەتەکانی ئێمە بە درۆ نازانێ تەنها کەسانێک نەبێ کە ستەمکارن. خودای گەورە هەموو ئەو ڕێگایانەی کە بە ئەقڵی مرۆڤدا دێن، موعجیزەیەکی بۆی داناوە، لەبەر ئەوەی بەندەکەی بگەڕێتەوە بۆ لای خۆی، کە بە تەنها خودای گەورە لە پشت ئەم دەسەڵاتەوەیە و هەر خۆی زانا و پایەبەرز و خاوەن دەسەڵاتە.

## قورئان و ئینجیل

زۆرێک لە خەڵکی بیرکردنەوەیان وایە، کە باوەڕ بە هەندێ کەسی نەفام دەکەن کە دەڵێن دین بە دەستی ئێمەیە و ئەم کەونە هی ئێمەیە، یان مرۆڤێک دەکەنە خودای خۆیان و دەی پەرستن ئەم مرۆڤە چ توانایەکی هەیە چ موعجیزەیەکی هەیە بیسەلمێنێت، ئەگەر ئەم مرۆڤە خودایە و ئەم دونیایەی دروست کردووە با بۆمان بسەلمێنێت! با بتوانێت پیرێک گەنج بکاتەوە! با بتوانێت ئاژەڵێک بهێنێتە قسە! جگە لە (پەروەردگارمان) نەبێت هەر ئەوە دانەری زەوی و ئاسمانە و تاک و تەنهایە. گەورە ترین ستەم کە مرۆڤ لە خودی خۆی و خودای گەورە دەکات، ئەوەیە کە هاوەڵ بۆ خودای پەیدا دەکات. بەڵام وەک لەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆدا دەیبینین و دەیبیستین، زیاتر لە ٥ ملیار کەس باوەڕیان بەم خودایە نیە! نزیکەی ٢ ملیار کەس کە مەسیحن (نصرانی) باوەڕیان وایە بەوەی کە (پێغەمبەر عیسا) سەلامی خودای لێبێت کوڕی خودایە کە ئەمەش لە چەندین شوێنی قورئان سەلمێندراوە کە (پێغەمبەر عیسا) سەلامی خودای لێبێت پێغەمبەری خودایە و بەندەی خودایە. بەڵام ئەم جۆرە

مرۆڤانه باوەر ناکەن بەم ئایەتانەی خودا وە ئەمەش بەڵگە بۆ ئەو کەسەی دەڵێت مەسیح ڕاستە، باشە با چاپی ئینجیل ٢٠ ساڵ پێش ئیستا بهێنین، با بزانین چی گۆڕاوە چەندەها دەسکاری کراوە تەنها لەماوەی ئەم ٢٠ ساڵەدا ئەگەر هی چاپی ١٠٠ ساڵ پێش ئیستا بێنین هەر نای ناسینەوە کە ئەمە ئەو ئینجیلەیە. یانی خودایەک بەو گەورەیە نەتوانێت کتێبێکی وا بەبێ دەسکاری بەجێ بێلێت ئایە شاستەی پەرستنە!!! ئەمەش بەڵگەیەکیتر لەوەی کە قورئان ڕاست و دروستە و پەیامی خودایە. چونکە قورئان لەوەتەی هەیە هیچ پیت و حەرەکەیەک دەستکاری نەکراوە. داهاتوو هەر بۆ ئیسلامە. خودای گەورە دەفەرموێت: (يُرِيدُونَ أَن يُطْفِئُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَيَأْبَى اللَّهُ إِلَّا أَن يُتِمَّ نُورَهُ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ) (التوبة ٣٢) واتە: (ئەوانە بەو بیروباوەڕە پووچانەیانەوە دەیانەوێت نوور و ئاینی خودا بەقاڵەی دەمیان بکوژێننەوە و خامۆشی بکەن، بەڵام خەیاڵیان خاوە خودا ناهێلێت ئاواتیان بێتە دی و هیچ شتێکی تری ناوێت جگە لەوە نەبێت ئاین و نووری خۆی سەربخات و نووری خۆی تەواو بکات و دەری بخات، هەرچەندە کافر و بێ باوەڕان پێی سەغڵەت و دڵتەنگ بن) لەم ڕۆژەشدا دیارە کە سەلمێنراوە کە دینی ئیسلام

سەرکەوتووترین دینە و کە ڕۆژانە هەزاران کەس موسڵمان دەبێت، کە پێشبینی کراوە، دوای ٥٠ ساڵ، سەرکەوتن بۆ ئیسلامە، و ئیسلام دەبێتە یەکەمین ئاین لە جیهاندا. خودای گەورە لە قورئاندا دەفەرمووێت: (ئەوەی پاک و سود بەخش بێت بۆیان حەڵاڵ دەکرێ وە ئەوەی پیس و زیان بەخش بێت لێیان حەرام دەکەین) با تەماشای کتێبی ئینجیل بکەین کە زینا حەڵاڵە، زینا سەدان نەخۆشی گواسراوە بۆ مرۆڤ دەهێنێت، گۆشتی بەراز ئاساییە لای ئەوان، کە ئەویش هەڵگری سەدان نەخۆشیە. وە مەشروب لای ئەوان حەڵاڵە کە ئەویش چەندەها زیانی بۆ لەشمان هەیە. کە ئەمەش بۆمان دەردەکەوێت کە ئاینی ئیسلام ئاینێکی پاکە و ئاینێکە بۆ بەڕێوبردنی ژیان و خۆشگوزەرانی و خۆشبەختی.

## بۆچی خودا لەسەرەتای مرۆڤایەتییەوە قورئانی نەنارد؟

دەبێت لەو باوەڕەدا بین، کە هیچ کاروبارێکی خودا بێ نیعمەت نییە، چونکە خودا خۆی عیلمی زانستی ئێستا و داهاتووی پێیە، هەر خۆی دەزانێت کەی گونجاوترین کاتە بۆ ئەوەی ئەنجامی بدات بۆمان. باوکێک بە منداڵەکەی دەلێت: کورم، دەبێت ببیت بە دکتۆر، سەرەتا دەتنێرمە باخچەی ساوایان، پاشان خوێندنی سەرەتایی، پاشان ناوەندی پاشان ئامادەیی، ئینجا زانکۆ و ئینجا بەشی دکتۆری. منداڵەکەش دەڵێت: باشە باوکە! ئەی بۆ یەکەم جار نامبەیت بۆ بەشی دکتۆری. لێرەدا ئەوە ڕوون دەبێتەوە هەموو شتێک مەرحەلە مەرحەلە دەبێت، هەموو شتێک لە کاتی خۆی، سەرەتای مرۆڤایەتی قۆناغێکی سادە بووە و ئاستی پێشکەوتنیان نزم بووە، ئێستاش ئەوەیە کە دەیبینین، لە چی مەرحەلەیەکداین، بۆیە خودا لە سەرەتای مرۆڤایەتی قورئانی نەنارد، سەرەتای مرۆڤایەتی لە ئاستێکی سەرەتادا بوونە، تەنانەت توانای قسەکردنیان بە باشی نەبووە، جا چۆت بتوانن لە کتێبێک تی بگەن. بۆیە هیچ کارێکی خودا بێ نیعمەت نیە، چونکە

هەر خودا خۆی دانا و زانایە بەرنامەڕێژی دونیا خۆیەتی،
خۆی باشتر دەزانێت چی باشترە ئەنجامی بدات.

## چۆن خودا بپەرستین؟

خودا دەپەرستین بەوجۆرەی خودا و پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) فەرمانیان پێکردوین.

خودای گەورە دەفەرمووێت: (يا ايهاالذين امنوا أطيعوا الله وأطيعوا الرسول ولا تبطلوا أعمالكم) (محمد ٣٣) واتە: (ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە گوێڕایەڵی خودا و گوێڕایەڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بن کردەوەکانتان پوچەڵ مەکەنەوە)

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: (من عمل عملا ليس عليه امرنا فهو رد) (صحيح مسلم١٧١٦)

واتە: (هەرکەسێک کردەوەیەک ئەنجام بدات فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت ئەوا ئەو کردەوەیە ڕەتدەکرێتەوە و وەرناگیرێت) بۆیە لە خۆتی گران مەکەن و قورسی مەکەن لەسەرخۆتان، کە بلێت ناتوانم، دڵنیابە خودا هەرگیز داوای شتێکی گرانی لی نەکردووین، ئیلا کە نەتوانین، دڵنیابە داوای شتانێکمان لێ کراوە کە لە توانای ئێمەدایە و دەتوانین ئەنجامی بدەین. خودای گەورە ئاساتکاری زۆری بۆ کردووین، بە ڕادەیەک کە هیچ بیانویەکمان نیە کە بلێین ناتوانین بۆ نموونە نوێژ کە

واجب کراوە لە شەرعی خودادا، گەرتواناى بە پیوە ئەنجامدانیت نیە بە دانیشتنەوە  ئەنجامی بدە، بە دانیشتن ناتوانیت بە پاڵکەوتنەوە، بە پاڵکەوتنەوە ناتوانیت بە چاو ئەنجامی بدە، بە چاویش توانات نیە بە دڵ ئەنجامی بدە. ماشاءالله لە خودایەک کە بەو شێوازە کاری بۆ ئاسان کردووین، خودایەک کە ئەوەندە بە ڕەحم بێت بەرامبەرمان، خودایەک ئەوەندە ئێمەی خۆشبوێت، کە ئەوەندە ئاساتکاری بۆ کردووین، ئاخر بۆ ناگەڕێینەوە بۆلای خوا، واز لە تاوان ناهێنین. (خودایە بە ڕەحمی خۆت لە تاوانەکانی هەموو بەندەکانت خۆش ببە، هەرگیز بە کردەوەی خۆمان ناتوانین، بە بەهەشت شادببین بە بێ ڕەحمەتی تۆ خودایە)

# کاری ئێمەی مرۆڤ چییە

هەمیشە پرسیارێک زۆر باوە لەناو خەڵکیدا، تەنانەت لەلای موسڵمانانیش، لێرەولەوێ ئەم پرسیارە دووبارە دەبێتەوە، ئایا خودای گەورە بۆچی ئێمەی دروستکردووە؟

خودای پەروەردگار دەفەرموویێت: (وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ) (الذاريات ٥٦) واتە: (جنۆکە و مروڤمان دروست نەکردووە ئیلا بۆ ئەوە نەبێت کە بە تەنها من بپەرستن)

خودای گەورە ٣ جۆر مەخلوقی بۆ بەندایەتی دروستکردوە، واتا ئەم ٣ جۆرە خودای گەورە تەنها بۆ بەندایەتی دروستی کردوون.

١. فریشتە (مەلائیکەت): ئەم جۆرە مەخلوقە هیچ جۆرە شەهوەت و شوبهاتێکیان نیە. تەنها لە فەرمانی خودای گەورەدان بۆ بەندایەتی، جۆریان زۆرە نمونەی جۆرەکانیان، هەیانە تەنها لە سوجدەدایە بۆ پەروەردگار، یاخود لە رکوع دایە...

٢. (جن): ئەم مەخلوقە بۆ بەندایەتی دروست بوون، خودای گەورە ئازادی کردوون لە ژیانیاندا واتە خۆیان هەڵیدەبژێرن، بەندایەتی بکەن یان سەرپێچی بکەن،

سروشتی ئەم مەخلوقە وایە، کە باندایەتی کرد وەک فریشتە دەیکات، کە خراپەشی کرد دەبێتە شەیتان، ئیبلیس لەم جۆرە مەخلوقەیە کە پێشتر وەک فریشتە بەندایەتی دەکرد و خودای گەورە پلەی بەرزکردبووەوە لە پلەی فریشتەکاندا بوو.

٣. مرۆڤ (ئینسان): ئەم جۆرە مەخلوقە بەڕێزترین جۆری دروستکراوی خودای گەورەن و ئازادی ڕەهایان پێدراوە لە کردارەکانیان. ئەگەر ژیانیان لە بەندایەتیدا بەکارهێنا، لە پلەی فریشتەکان بەرزترە، بەو مەرجەی ژیانی لە بەندایەتیدا بێت.  ئەگەر ژیانی لە خراپەکاریدا بەکارهێنا وەک ئاژەڵ هەژمار دەکرێت، ئەوکەسانەی کە ئامانجیان نیە لە ژیانیاندا، واهەست دەکەن بێهودە دروست بوون، کاریان نیە و باندایەتی ناکەن، ئەوە وەک ئاژەڵەکان دەژین. بۆ نمونە: ئاژەڵ دەخوات و دەخەوێت و حەزی جودبوون (جیماع) هەیە و ئاژەڵ خێزانیش دروست دەکات، لە کۆتایدا دەمرن هیچ ئامنجێکیان نیە.

# ئیبلیس فەرمانی خودایی شکاند

دڵنیابە لەوەی کە قسەی خودا بشکێنی دەبێت چاوەڕێ هەموو شتێک ببیت کە بەسەرت بێت، وەک قورئان دەگێڕێتەوە کە دوای ئەوەی ئیبلیس خۆی لەوە بە گەورەتر زانی کە فەرمانی خودا جێبەجێ بکات و تانە و تەشەری لە دادگەری و زانستی خودا، خوداش وڵامی سەرپێچی کردنەکەی دایەوە و لە بەهەشت دەریکرد. ئیبلیسیش داوای لە خودا کرد کە تا ڕۆژی دوای بیهێڵێتەوە و ژیانی پێ بدات، خوداش قبووڵی کرد. موسوڵمانان بڕوایان وایە کە ئامانجی ئیبلیس لەمەدا بریتی بوو لە بەکارهێنانی وزە و تواناکانی لەسەر لێشێواندن و گومڕاکردنی ئادەمیزاد، بەمەش جەنگ دروست بوو لە نێوان ئادەم و نەوەکانی لە لایەک و ئیبلیس و نەوەکانیشی لە لایەکی تر. خوداش ویستی وا بوو مرۆڤەکان تاقی بکاتەوە و ئادەمیزاد بە ویستی خۆی ڕێگای خوداویستیی و بەهەشت هەڵبژێرێت نەک بە زۆری خودا بەم شێوەیە، موسوڵمانان وا باوەڕیانە کە دژایەتی نێوان ئیبلیس و ئادەم و نێوان نەوەکانیان دژایەتییەکی دێرینە. دیسان بەشێک لە باوەڕی ئیسلام و فێرکردنەکانی

بەو جۆرەیە کە ئەبێ ئادەمیزاد هۆشیار و وریا بێ لەو فێڵ و شێوازانەی ئیبلیس، کە لە ڕێیانەوە ئەیەوێ تووشی سەرپێچییەکانی خودایان بکات.  لە ٢٠٢٠ هیندستان کە بە ئازادی و بەئاشکرا موسڵمانیان دەکوشت بە ئاشکرا تێزابیان دەکردە بە دەم و چاوی موسڵمانان مزگەوتەکانیان دەڕوخان، ناچاربوون بکەونە جیهاد، و هەموو موسڵمانانی هندستان هەڵسان، بەڵام هەرچەندە وڵاتان کار لەسەر ئەوە بکەن کە موسڵمانیەتی لەناو بەرن، هەوڵەکانیان پوچەل دەبێتەوە. زۆرمان لە وڵاتان بینی چیان لە موسڵمان کرد، بەڵام موسڵمانی باوەڕدار هەر باوەڕی وایە کە خودا تۆلەیان بۆ دەکاتەوە یەقینیان بە خودا هەبوو. تەنها بە خۆگردنیان بە عیبادەد بۆ حساب دەکرێت.

# نیعمەتی خودا و موعجیزەکانی

نەزان مەبە لەبەرامبەر ئەو نیعمەتانەی خودای گەورە کە پێت دەبەخشێت، خودای گەورە سەیارەیەکی جوانی پێ بەخشیوی، خانویەکی خۆشی پێ بەخشی، ئەوە بزانە ئەوە نیعمەتی خودایە، ئازایەتی خۆت نیە، بە پشتیوانی خودا نەبێت، هیچ کارێک ئەنجام نادرێت، ڕاستە چەندین شت دەبێتە هۆکار بۆت، بەڵام دڵنیابە هەموو ئەو هۆکارانە خودای گەورە دەیهێنێتە ڕێت، بەبێ پشتیوانی خودا هەرگیز ناتوانیت شتێک بەدەست بهێنیت، هەمیشە سەپاس گوزاری خودا بکە، بەوەی کە هەتە و بەوەشی کە نیتە.

(اللَّهُمَّ ارْحَمْنِـی وَارْزُقْنِـی وَعَافِنِـی وَاهْدِنِـی) (خودایە ڕەحمم پێ بکە و ڕزقم بدە و لاشەم ساغ بکە و هیدایەتم بدە) دڵنیابە ئێمە نازانین خێر بە چی شتێکی ژیانماندا هەیە، دڵنیابە خودا من بە نەبوونی شتێکەوە تاقیدەکاتەوە، تۆش بە بوونی شتێکەوە. بۆیە هەرگیز وابیرمەکەوە ئەوەی کە تۆ هەتە کەسێکی تر نیەتی، واهەست بکەیت تۆ کەسێکی بەهێزتری لەو نا دلنیابە خودا هەر دووکتانی بە شێوازێک تاقی کردۆتەوە، بەڵام هەر یەکێکتان بە شێوەیەک

تاقیکردۆتەوە. کاتێک حاڵت باشە، بەڵام ماڵی براکەت یان دراوسێکەت کە حاڵیان خراپە، مەلێ ئێمە عەقلمان هەیە ئەوان نیانە، یان ئیمە کەسانی باشین ئەوان خراپن، نا نەخێر، ڕاستە ئەمانە تەنها قسەیەکە لات دەڕوات، بەڵام لە قیامەت شکاتت لێدەکات. دڵنیابە لەوەی خودا تۆی بەو دەولەمەدیە تاقی کردۆتەوە ئەویشی بەو هەژاریە تاقیکردۆتەوە.

پێش بینی هەیە دەلێت لە هەر ١٠٠ کەسێکی موسڵمان کەسێکی قورئانی لەبەرە بەڵام لە ئاینی مەسیحدا کەسانێکی کەم دەزانن، کە زۆر بەی قەشەکانیان لەبەریان نیە، زۆربەشیان زانیاریان لەسەر دینەکەیان نیە، خودا و پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) ئاسان کاری زۆری بۆ کردووین، تا لەم ژیانە کورتەمان بیبەینە سەر، بەڕاستی کارەساتە مرۆڤێک کە دینی ئیسلام و فەرموودەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بیستبێت و ئیمانی پێ نەهێنابێت. بەڕاستی ئەقل پێشبینی ناکات، خودایەک تۆی مرۆڤی لەسەر هەسارەیەک دروست کردووە، کە بێجگە لەم هەسارەیە ژیان ئەستەمە لەسەرهەسارەیەکی تر بژیت، کە هەموو پێداویستیەکانی ژیانی بۆ لەسەر داناوی دەتوانی بەکاری بهێنیت بۆ کێ؟ بۆ تۆی مرۆڤ. یەکێکی تر لە

موعجیزەکانی خودا ئەوەیە کە زەوی سێیەم هەسارەیە کە لەخۆرەوە دوورە، زوهرە کە دووەم هەسارەیە پلەی گەرمای ٤٨٠ پلەی سەدیە تا ئێستا هیچ جۆرە ژیانێکی لێ بەدی ناکرێت، ئەمەش ئەوەندە گەرمە کە هیچ شتێک بەرگەی ناگرێت. پێنجەم هەسارەش کە لە خۆرەوە دوورە زوحەل، کە پلەی گەرمی لە -١٨٠ بۆ -٢٠٠ پلە دەبێت، کە ئەمەش ئەوەندە ساردە هیچ شتێک بەرگەی ناگرێت. بەڵام سەیری کەشوهەوای زەوی بکەین، کەش و هەوایەکی مامناوەندی هەیە نەسارد، نەگەرم، بەڕاستی ئەمە نیعمەتی خودای گەورەیە بۆ مان کە بۆمانی داناوە، هەندێکیش هەن ئەمەش دەدەنە پاڵ مرۆڤێک، خودا بمان پارێزێت. هەسارەی چوارەمیش بەناوی موشتەری، کەوتنە خوارەوەی کلکداری شومینکۆ کە لە ساڵی ١٩٩٤ کەوتە سەر موشتەری، ئەگەر ئەم هەسارەیە نەبووایە دەکەوتە سەر زەوی و ژیان کۆتای پێدەهات و هەمووشتێکی لەناو دەبرد. بەڕاستی ئەم ڕووداوانە ئێمە پێویستە دەرسی لێوەربگرین، کە پیویستە لیی فێربین، کە ئەم هەموو کارەسات و موعجیزانە دەسەلاتێکی گەورەی لە پشتە، کە ئەو دەسەڵاتەش بە یەقینەوە باوەڕمان وایە، کە کرداری پەروەرێنمانە.

# ئەو موعجیزانەی لەشی خـۆت بزانە

زاناکان دەڵێن:

* ئەگەر گەروو(قوڕگ) ی مرۆڤ، کەمێک فراوانتر بووایە لەوەی کەهەیەتی، ئەوا ئەوکەسە دەنگی نەدەما، خۆئەگەر کەمێک، تەسک تر بووایە، ئەوا هەناسەدانی بە زەحمەت و ناڕەحەت دەبوو!! جا یان هەناسەدان ئاسان دەبوو، بەڵام دەنگ نەدەما، یان دەنگ دەبوو، هەناسەدان ناڕەحەت دەبوو.!

* ئەگەر: لیکی ناودەم تۆزێک شیرینتر بووایە، ناو دەممان دەبووە کونەمێش وهێلانە مێروولە و بێزاردەبووین بە مێش و مەگەز،! خۆ ئەگەر شیرینی لەوەی ئێستا کەمتر بووایە، ناودەممان هەمووکات تفت و تاڵ دەبوو، دیسان ژیانمان بۆ نەدەکرا.

* ئەگەر هەستی بینینی مرۆڤ کەمێک بەهێزتر بووایە لەوەی کەهەیەتی، ئەوا ژیان دەبوو بە ژان ومردن. خۆ ئەگەر تەماشای پەرداخێ ئاوێکمان کردبا، ئێستا کەوا بە جوان وسافی دەبینین، ئەوا هەزاران ڤایرۆس و بوونەوەری بچووکمان تێدا دەبینی، کە ئێستا نایان بینین، ئەوکات نەمان دەتوانی ئاو بخۆینەوە و لە تەنێتیدا دەخنکاین.!

* ئەگەر فرمێسک کەمێک سوێرتر بووایە، هەرچی مولولەخوێنی چاوەکان هەبوو دەسوتانەوە و هەمووکات چاومان سوور دیاردەبوو. (وەک کەسی هارمان لێدەهات) خۆ ئەگەر سوێریەکەی کەمتر بووایە، ئەوا چاوی پاک نەکردەوە و سوودی نەدەبوو!

* ئەگەر هەستی بیستنی مرۆڤ بەهێزتر بووایە لەوەی کەهەیەتی، ئەوا نەیدەتوانی هەر بشخەوێت، هەرچی دەنگ هەبوو دەیبیست و لەبەر ناڵە و گرمەگرمی گەدە و هاتووچۆی خوێن وترپەی دڵ وهەموویان وەک کارگەیەکی گەورەیان لێدەهات و ژیانیان لێ دەشێواند.

* ئەگەر هەستی دەست لێدانی وهەستەوەری مرۆڤ زیاتربووایە لەوەی کەهەیەتی، ئەوا هەستی بە هەموو شەپۆل و بارگە کارەباییەکانی دەوروپشتی خۆی دەکرد، کە لە هەوادا بڵاون و ژیانیان لێ تێک دەدا.

بەڵگەی توانا و دەسەڵاتی خوای گەورە لە خوودی خۆماندا هەیە، ئەوە بۆ ئەو گەورەیی ودەسەڵاتی خواییە نابینین؟؟ پاک و بێگەری و دەسەڵات تەنها بۆ ئەو خوایەیە، کەهەموو شتێکی بە ئەندازە و ڕێک وجوانی دروست کردووە.

هەمووکات لەدڵەوە بڵێ: (سبحان الله وبحمده استغفرالله)

## ناشکور مەبە

لەم ڕۆژەدا زۆرێکمان ناشوکری دەکەین، بەو بەشە ڕازینین کە خودا پێمانی بەخشیوە، وەک ئەو موسڵمانەی دەی وت خودایە تەمەنم درێژبکەی، دوای ئەوە خودایە هاوسەرێک بکەیتە قسمەتم، دوای ئەوە خودایە کوڕێک، وەدواتر خودایە دەی کچێکیشمان باریێ، بەڵام کە شتێک کە بۆی نابێت، ناشوکری دەکات، ڕەخنە لەو زاتە دەگرێت کە پێی گەیاندووە و یارمەتی داوە، دڵنیابن دونیا تاقیکردنەوەیە بۆ ئێمەی موسڵمانان، بەڕاستی لە ڕۆژێکی وەک ئەمرۆدا کە دونیا پڕە لە خراپەکاری، دونیا پڕە لە لەشفرۆشی، دونیا پرە لە خەم و خەفەت و مەینەتی، وەک پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەرموویێت: (الدُّنْيَا سِجْنُ الْمُؤْمِنِ، وَجَنَّةُ الْكَافِرِ) (صحيح مسلم) واتە: (دونیا زیندانی باوەردرانە و بەهەشتی بێ باوەڕانە) مانای ئەم فەرموودەیە ئەوەیە کە موسڵمانی ڕاستەقینە، ترسانە لە خودا، خۆگردنە لە حەرام، خۆگردنی چاو بۆ شتی حەرام، نەخواردنە لە شتی حەرام چونکە ئازادی مرۆڤ لە بەهەشتە نەوەک دونیا. بەهەشت ئەو شوێنەیە کە یەک دەقەی خۆشی ئەویێ هەموو خۆشیەکانی ئیستا دەهێنێت،

بەراستی لەم ڕۆژەدا کەسی خۆی دەوێت کە خۆڕاگر بێت، لەم ڕۆژەدا بۆ بەدەست هێنانی ئەو فیردەوسەی کە خودای گەورە دایناوە بۆ باوەرداران. خودا ئەوەی دەوێت کە بەندەکەی ڕوو لە ڕێگای ڕاست بێت و یەکتاپەرست بێت، بەڵام کەممان واین. بۆ نموونە کاتێک بەڵایەک یان موسیبەتێک ڕوو لە کۆمەڵگایەک دەکات، کە دانیشتوانی ئەو کۆمەڵگایە دەبن بە ٢ بەشەوە بەشێکیان سوپاسگوزاری خودان بەشێکیان ناشوکری دەردەبڕن، وەک ڕۆژگارەی ئەمڕۆ کە دەیبینین. بەڵام بە دڵنیاییەوە ئەو کەسانە براوەی دونیا و دوا ڕۆژ دەبن، کە هەمیشە سوپازگوزاری خودایان کردووە، بە ڕێچکەی هەمیشەی ژیانیان.

بە ڕاستی ئێمە بەم شێوەین ئیمە کاتمان تەرخان نەکردووە بۆ خودا ((ئێمە کەسانێکین کە چاوەڕێین بانگ تەواو بێت بۆ ئەوەی گۆرانیەکانمان پێ بکەین)) بەڵام لە ڕوانگەی شەرعی خودای گەورەوە، کە پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: کاتێک گوێمان لە دەنگی بانگ بوو، وڵامی بانگ بدەینەوە و سڵاو درود بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بنێرین. بەڵام ئێمە نەکاتمان بۆ خۆمان و نە بۆ ئەو خودایەی کە هەمووومانی دروست کردووە دانەناوە، کە

هەموومانی تێکەڵ بە ناز و نیعمەت کردووە، ئێمە پێیی نازانین. هەزارەها نیعمەت هەیە کە خودا پێی بەخشیوین، کەچی کەمێکمان سوپاس گوزاری خودا بووینە لەسەری. وەک ئەو ئۆکسجینەی ئێمە هەڵی دەمژین بەبێ بەرامبەر تەنها ٣ دەقە بەبێ ئەو ئۆکسجینە کە لە هەوادایە ناژین. زۆرێک لە بێباوەڕانی ئەم سەردەمە دەپرسن، کە سودی دارستانەکان لە چی دایە، کە ئەمە گەورەترین تاوانە بەرامبەر بە دروستکراوێکی خودا، بۆیە لێرەدا وڵامێکی بە پێزیان دەدەینەوە، وەک و چۆن لە سەرەوە باسمان کردووە. ئەگەر دار و درەخت و دارستانەکان نەبن سەر ڕووی زەوی پڕدەبن لە گازی دوانۆکسیدی کاربۆن، کە ئەمەش گازێکی کوشندەیە کە مرۆڤ نەیدەتوانی ژیان لەسەر زەوی بکات. تەماشا دەکەین کە وڵاتی تورکیا کە لە ساڵی ٢٠٢٠ کاتێک دارستانەکان ئاگریان تێبەربوو، داوای بەهاناوەچوونی لە زۆربەی وڵاتانی زلهێز کرد، کە یارمەتیدەریان بنن لە کوژانەوەی دارستانەکانیان. پسیارێکت لێ دەکەم سوپاس گوزاری خودا بوویت ئەمڕۆ بۆ هەڵمژینی ئۆکسجین؟ بەڕاستی ئەوەندەی کاتمان بۆ پرکردنی گیرفانمان داناوە، ئەوەندە بۆ خودای گەورەمان دانەناوە ئەوەندەی کاتمان بۆ زنجیرەو و فلیم داناوە

ئاگامان لە خودامان نەماوە. بەڕاستی ئێمە بەندەی گوناهبارین، دەبێت بە خۆماندا بچینەوە، پێویستە ئێمە ژیانێکی نوێ دروست بکەین، دڵنیابن تەنها ڕێی خودا دەمانگەیەنێتە بەهەشت. ئەم گەردونە خودا بەس بۆ من و تۆی دروست کردووە، ئەم هەموو چیا و شاخ و درەختە لەبەر من و تۆ دروست کردووە، هەرکەسێکی تر بێت هەر مرۆڤێک بێت، هەر ڕۆژێک دەیداتە ڕوومانەوە، ئەوە فلان کەس نیە کە ئەوەم بۆی کرد! ئەوە فلانە کەس نیە کە ئەوەم داپێی. دڵنیابە بەس خودا چاکەی تۆی دەوێت بۆیە هەمیشە سوپاس گوزاری ئەو خودایە بە کە تۆی گەیاندە ئەم ڕۆژە کە بە ئارەزووی خۆت هەڵسوکەوت دەکەیت، دەمەوێت ئامۆژگاریەکت بکەم هەرگیز سەیری سەرووی خۆت مەکە، هەرگیز مەڵێ فڵان کەس ئەوەی هەیە، فڵان کەس لەواچێ بە ئارەقەی ناوچەوانی کردبێتی یان بە کاری حەرام کردبێتی، ئەوە خودا خۆی ئاگای لێیە یان سزای دەدات یان توشی خێری دەکات. بچوکترین کردەوە بە گەورە و بچوک لای خودا ون نابێت، جا هەرچەندە کۆن بێت هەر دەمێنێت لای خودا، تا ڕۆژی قیامەت. مرۆڤ بە گوێرەی ئیمانی تاقی دەکرێتەوە، لەواچی مرۆڤێک بەهۆی لە دەستدانی ماڵ و سامانی،

ئەشێت بە لە دەستدانی ئەندامێکی لەشی بێت. خۆڕاگری ئێمە لەسەر تاقیکردنەوەکان کە خودا لەسەرمانی دەکات، نزیک بوونەوەی ئێمەیە لە بەهەشت. تەنها ئەوەندە بەسە کە هەر جۆرە تاقیکردنەوەیەکی هێنایە پێشت بلێیت ((سوپاس خودایە)) (وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ) (الذاريات ٥٦) واتە: (من جنۆکە و مرۆڤم دروست نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێ کە بە تاک و تەنها من بپەرستن و ملکەچی فەرمانی من بن) کە خودای گەورە بۆمان ڕووندەکاتەوە کە مرۆڤ و جنۆکە دروستکراوی خۆین و هەروەها بێ پێویستە لە دروستکراوەکانی. بیرمان نەچێت کە خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: لەواچی تەنها بەو قسەیەت خودا لە هەموو تاوانەکانت خۆش ببێت ئەگەر بەقەت کەفی دەریاش بێت بەڵام هاوەڵت بۆ خودا پەیدا نەکردبێت. بۆیە هەموومان با بلێین سوپاس خودایە بۆ هەموو شتێک. خودا چارەنوسمانی دیاری کردووە، تەمەنێکی وا ناژین کە ناشوکری بکەین چاوچنۆک مەبە، ئەو بەشەی خودا بۆتی داناوە هەرچەنێک بێت پێی شکور بە، چونکە دڵنیابە حاڵت هەر چۆنێک بێت، کەسێک هەیە کە لە تۆ خراپ ترە و ئاوات بەو بەشەی تۆ دەخوازێت کە خودا بە تۆی

بەخشیوە و تۆ پێی نازانیت. خانویەک و هاوسەرێکی باش و پارویە نان بەسە بۆ ئەوەی ژیانێکی خۆش بەڕێ بکەیت. ئەگەریش زۆرە کە کەسێک ئەوانەشی نەبێت بەڵام دڵخۆشی لە لوتکە بێت. ڕاستە هەندێ شتی مادیش هەیە کە بۆ خۆشکردنی ژیانە وەک پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویێت: (من سعادة ابن آدم المرأة الصالحة والمسكن الصالح والمركب الصالح) واتە: (خۆشبەختی مرۆڤ چەن شتێکە، هاوسەرێکی باش، خانو و ماڵێکی باش، هۆی گواستنەوەی باش) بەڵام پێش هەموو ئەو شتانە دەبێت مرۆڤەکە خۆی خاوەنی دڵ و دەرونێکی باش بیت، لە دڵەوە هەست بە خۆشی بکات بۆئەوەی بتوانێت بە شێوەیەکی باشتریش سوود لە هەموو ناز و نیعمەتە مادیەکان وەربگرێت و چێژێکی زۆرتریان لێ وەربگرێت. لە نامەی یەکێکدا کە پێش خۆکوشتنی نوسیبوی، (من گەنجێکم لەشم ساغە و هاوسەرێکی بە دڵ خۆمم هەیە، پارەیەکی زۆریشم هەیە، هەرچی دڵم بیخوازێت لەبەر دەسمدایە، جا کەوایە بۆچی بژیم) ئەمە قسەی کەسێک بوو، کە پێش ئەوەی خۆی بکوژێت، بەڕای ئەم کەسە کە خۆی کوشتوە وا هەست دەکات ژیانی ڕۆژانەی دووبارەیە هەموو شتەکانی ڕۆژانەی کە دەیکات

دووبارەیە، وا هەست دەكات ئازادی دەست دەكەوێت، یان تەواوكردنی ژیانێتی بە یەكجاری. (خۆكوشتن یەكێكە لە حەرامكراوەكان. ئێمە لە هەر بارودۆخێكی ژیاندا بین، نابێت هەرگیز پشت بە خۆكوشتن ببەستین، چونكە بۆ قیامەتمان باش نیە، لەوەیە توشی بارودۆخێك بین، بۆ هەتاهەتایە پەشیمانی دامانگرێت) بوونی شوێنێك بۆ مانەوە، هەرچەن بچوك بێت، پارویەك بۆ خواردن، هاوسەرێكی باش، بەسە بۆ ئەوەی ژیانێكی خۆش بەڕێ بكەیت.

پەندێكی كوردی هەیە دەڵێت: (ڕابردوو ماڵەكان بچوك بوون، بەڵام دڵی مرۆڤەكان گەورە بوون، كەچی ئێستا ماڵەكان گەورەن! بەڵان دڵی مرۆڤەكان بچوكن) كە موبایل هات سیلەی ڕەحم كەم بوویەوە، كە ئینتەرنێت هات زانست كاڵ بوویەوە، كە ئۆتۆمبێل زۆر بوو چێژی مانەوەی میوان نەمایەوە...هتد

# خودا بەندەکانی تاقی دەکاتەوە

خودا بەندەکانی خۆی چۆن تاقی دەکاتەوە، خودا ئەو بەندانەی تاقی دەکاتەوە کە خۆشیانی دەوێن، هەر بەڵا و ناخۆشیەک بەسەر هەر بەندەیەکی خۆی بێنێت ئیلا خێرێکی تێدایە. بۆیە هەرگیز بێ هیوا مەبە، هەرگیز ناشوکر مەبە. با سەیری ژیانی خۆشەویسترین کەسی خودا بکەین! خۆشەویسترین کەس لای خودا (پێغەمبەر محمد) (صلى الله عليه وسلم) بوو کە چی بەسەر نەهات! پێش ئەوەی لە دایک بێت، باوکی (عبدالله) کۆچی دوای کرد! لە ٦ساڵی دایکی (ئامینەی کچی وەهاب) کۆچی دوای کرد، لە ٨ ساڵی باپیری (عەبدولموطەلیب) کۆچی دوای کرد، هەموو کورەکانی کۆچی دوای کرد، ٢ لە کچەکانی تەلاقدران، توشی چەندین شەڕ هات، بەرد بارانیان کرد، لە مەدینە دەریان کرد، بوختانیان بۆ دایکە عایشەی خێزانیان هەلبەست، کە بە وەحی خودای گەورە مارەی کرد. ئایا خودا رقی لێ بوو وا تاقی کردووەتەوە!؟ بێگومان نەخێر. هەرگیز وا بیرمەکەوە کە خودا موسیبەتێک یان تاقیکردنەوەیەکی قورس بخاتە سەر ڕێگات، واتای ئەوەنیە رقی لێت بێت، یان دەیەوێت لە ناوبچی، یانی

خودا رقی لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو!؟ نەخێر. لەبەرئەوەی خۆشەویستی خودا بوو، خودای گەورەش خۆشەویستانی تاقی دەکاتەوە. دڵنیابە گەر بۆ ماوەیەک هیچ کێشەیەک یان بەڵایەک بەسەرمان دانەیات، دڵنیابە کێشەیەک لە ئیمانماندا هەیە. دڵنیابە خودا خۆشەویستانی تاقی دەکاتەوە، بزانە ئەگەر خودا هەر بەربەستێکی هێنایە سەر ڕێت، ئەوە بزانە خودا تۆی خۆشدەوێت، تۆی لە بەربەستێکی گەورەتر ڕزگار کردووە. هەمیشە متمانەی تەواوەتیت بە خودا هەبێت، چونکە هەرگیز بێ هیوات ناکات، هەرگیز جێت ناهێڵێت، هەمیشە ڕاست بە لەگەڵ ئەو خودایەی کە دروستی کردووین و هەموو مرۆڤایەتی سەر ڕووی زەوی بە باوەڕدار و بێ باوەڕەوە گەورە کردووە. بۆیە هەمیشە ڕازگۆبە، خودای گەورە لە فەرموودەیەکی قودسیدا دەفەرموێت: (أنا عند ظن عبدي بي ان ضن خيرا فله، وان ضن شرافله) واتە: (بەندەکەم نیازی بە من چۆن بێت منیش بەو شێوە دەبم لە گەڵیدا گەر نیەتی باشەی لە دڵدابێت بەرامبەر خودا باشتر دێنێتە ڕێگای، یاخود خراپە لە دڵیا بێت خراپتر دینێتە ڕێگای) بۆیە هەمیشە با دڵت پربێت لە باوەڕی ڕاست بە خودا. هەمیشە  ئەو شتانەی کە پەروەردگارت دایناوە لەبیری

مەکە، بۆیە متمانەت بە خودا هەبێت، دڵنیابە مرۆڤەکان ناتوانن ڕسقی تۆ ببڕن. دەبینین کە خودا ئەو هەموو پێغەمبەرانەی نارد بۆ ئەوەی ڕێگای ڕاست پیشانی خەڵکی بدەن و خەڵکی لە وەسوەسەی ڕێگای شەیتان لابەرن. خودا هەر پێغەمبەرێکی بە شێوازێک تاقی کردۆتەوە، بۆ ئەوەی کە مرۆڤ تێبگات کە خودا هەموو ئەو بەندانەی کە خۆشیەوێت تاقی دەکاتەوە.

* (پیغەمبەر ئادەم) ماوەی ١٠ ساڵی پێچوو، لە دۆزینەوەی دایکە حەوا، کاتێک کە بە فەرمانی خودای گەورە لە بەهەشت نێردرانە سەر ڕووی زەوی، لە خاکی هندستان دایەنینا کە لە کێوی عارەفە بە یەکتر شاد بوونەوە.

* (پێغەمبەر یاقوب) کە ٤٠ ساڵ دەردی دوری چەشت، دەردی  چاوەروانی چەشت، ٤٠ ساڵ گریا لە دوری جگەرگۆشەکەی، کە (پێغەمبەر یوسف) بوو بەڵام هەرگیز ناشوکری نەکرد بۆیە خوداش هەر بۆی گێڕایەوە.

* (پێغەمبەر یونس) لەناو زگی حوت دابوو، هەر زیکری دەخوێند، ناشوکری نەکرد.

* بەحر نەیتوانی (موسا) نوقم بکات.

* چەقۆ نەیتوانی (ئیسماعیل) بکوژێت.

* ئاگریش نەیتوانی (ئیبراهیم) بسوتێنێت.

* کۆمەڵێکیش ویستیان (پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) بکوژن بەڵام نەیان توانی هەوڵەکەیان پووچەڵ بوویەوە

* براکانی (یوسف) هەوڵیان دا (یوسف) لە ناو بەرن، بەڵام نەیانتوانی، خودا کردی بە عەزیزی میسرٍ و لە داهاتوشدا بە زەلیلی براکانی هاتنە بەردەمی. ئەمەش مانای وایە هەموو شتێک بە ئیزنی پەروەردگار دەبێت، وە خۆی ویستی لێبێت دەبێت و ویستی لێنەبیت نابێت. کێشەیەکت هەبێت کاتێک دەڕۆیت بۆلای بەندەیەکی خودا، بۆی باسدەکەیت دەڵێت: خودا کارت بۆ ئاسان بکات!!! ئی کەوایە بۆچی ناچیت بە خوداکەت بڵێیت؟ کە تۆ بە بەندەکانی خودا دەڵێیت ئەوانیش دەڵێن خودا یارمەتیت بدات! کەوایە هەر کێشەت هەبوو، هاوار مەکە بۆ خەڵکی تەنها هاوار و ناڵە بکە بۆ پەروەردگارت.

# ڕۆژێک لە ماڵی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم)

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کاتێ بەیانی بەسەردا بهاتایە، لە مزگەوت نوێژی بە هاوەڵان دەکرد، پاشان دادەنیشت لە شوێنی نوێژەکەیدا و زیکری خوای دەکرد تاوەکو خۆر دەردەکەوت، هاوەڵانیش لەگەڵی دادەنیشتن، هەندێ جار باسی زەمانی نەفامیان دەکرد و پێ دەکەنین.  وە نوێژی چێشتەنگای دەکرد، چوار ڕکات یاخود زیاتری دەکرد، عائیشە خوای لێ ڕازێ بێت دەڵێت: (كَانَ رَسُولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) يُصَلِّي الضُّحَى أَرْبَعًا، وَيَزِيدُ مَا شَاءَ اللهُ) (رواه مسلم ٧١٩ ) واتە: پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) چوار ڕکات نوێژی چێشتەنگای دەکرد و زیاتری دەکرد ئەوەندەی خودا ویستی لەسەر بووایە. بەڵام لەماڵەکەیدا، لەخزمەتی ماڵ و منداڵدا بوو، مەڕی دەدۆشی و جلەکانی خۆی پاک دەکردەوە و دەیدووریەوە و خزمەتی خۆی دەکرد و پێڵاوەکانی پاک دەکردەوە و کاتی کاتێ نوێژ بهاتبایە دەچوو بۆ نوێژ و نوێژی بە خەڵک دەکرد، پاشان دادەنیشت و گوێی لەشکایەتەکانیان دەگرد و ئامۆژگاری دەکردن و نێوانیانی چاک دەکرد، دواتر دەگەڕایەوە بۆ ماڵ.

وە پرسیار کراوە لە عائیشـە: (مَا كَانَ رَسُولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) يَعْمَلُ فِي بَيْتِهِ؟ فقَالَتْ: كَانَ بَشَرًا مِنَ الْبَشَرِ يَفْلِي ثَوْبَهُ، وَيَحْلُبُ شَاتَهُ، وَيَخْدُمُ نَفْسَهُ) (رواه أحمد ٢٦١٩٤ ، وصححه الألباني في الصحيحة ٦٧١) واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چی دەکرد لەماڵەکەیدا ؟ گوتی: ئەو مرۆڤێک بوو لەمرۆڤەکان، جلەکانی پاک دەکردەوە و مەڕەکەی دەدۆشی و خزمەتی خۆی دەکرد. لەڕیوایەتکی تردا هەر لە عائیشەوە هاتووە: جلەکانی دەدووریەوە و نەعلەکەی پینە دەکرد و ئەو کارەی دەکرد کە پیاوان لە ماڵدا دەیکەن.

(ئەبو هورەیرە) خوا لێی ڕازی بێت دەڵێت: (مَا عَابَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) طَعَامًا قَطُّ، إِنِ اشْتَهَاهُ أَكَلَهُ وَإِلَّا تَرَكَهُ) (رواه البخاري ٣٥٦٣، ومسلم ٢٠٦٤) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هیچ کات عەیبی لەخواردن نەدەگرد، گەر حەزی پێ بکردایە دەیخوارد گەرنا لێی دەگەڕا. هەندێ جار مانگ دەهات و دەچوو جگە لە خورما و ئاو هیچ شتێک نەبوو بیخوات.

وە عائیشە خوا لێی ڕازی بێت دەڵێت: ئێمە جاری وا بووە سێ جار مانگ نوێبوونەوەمان لە ماوەی دوو مانگاندا دەبینی، لە ماڵەکەی پێغەمبەری خودادا ئاگر نەدەکرایەوە، عوروە دەڵێ: گوتم : ئەی بەچی دەژیان ؟ گوتی: بە دوو

شته ڕەشەکە، خورما و ئاو، ئەوەندەش هەبوو، کە هەندێک دراوسێی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە ئەنساریەکان حوشتری شیردەریان هەبوون، کە لە ماڵەکانیانەوە شیریان بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەهێنا و ئەویش پێیدەداین. وە عادەتی موسوڵمانان لەو زەمانەدا وا نەبووە لە ڕۆژێکدا سێ جار نان بخۆن، وەک ئەوەی ئێستا هەیە، بەڵکو تەنها دوو جار نانیان دەخوارد، خواردنێک لە سەرەتای ڕۆژدا کە پێی دەوترا ( الغداء ) چونکە لە بەیانی دا بوو، (الغدوة) واتە: سەرەتای ڕۆژ و خواردنێکیش لەئێوارەدا و پێی دەوترا (العشاء) وە گەر بیویستایە خەڵک بۆ بابەتێکی گرنگ کۆ بکاتەوە بانگی دەکرد الصلاة جامعة پاشان قسەی لەگەڵ دەکردن، لە بارەی ئەو شتەی کەدەیویست، وە هەروەها گەر بیویستایە وەفدێک بنێرێت، هەواڵیان پێ بدات بە یاسا و تەشریعێک و هاوشێوەی ئەمانە. پێغەمبەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێش نیوەڕۆ دەنوست کە پێی دەوترێت (القیلولة) بەڵکو شەو بتوانێت شەونوێژ بکات، وەدەیفەرموو: (قِيلُوا فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَقِيلُ) (رواه الطبراني في الأوسط ٢٨ ، وحسنه الألباني في الصحيحة ١٦٤٧) واتە: قەیلولە بکەن شەیتان قەیلولە ناکات.

وە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەواڵی خەڵکی دەپرسی چ دەکەن و چ کارەن و لە بازاڕ چۆنن و سەردانی نەخۆشی دەکرد و وەڵامی بانگیان بۆ دەعوەت دەدایەوە و یارمەتی هەژار و بێ نەوای دەدا و هەموو کاتەکانی لە خزمەتی موسوڵماناندا بەسەر دەبرد و فەرمانی پێ دەکردن بە چاکە و ڕێگری لێ دەکردن لە خراپە و جگە لەمانەش:

(ئیمامی مسلم ١٠٢) لە (ئەبو هورەیرەوە) خودا لێی ڕازی بێت گێڕاویەتیەوە ودەڵێت: (أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) مَرَّ عَلَى صُبْرَةِ طَعَامٍ فَأَدْخَلَ يَدَهُ فِيهَا، فَنَالَتْ أَصَابِعُهُ بَلَلًا فقَالَ: ( مَا هَذَا يَا صَاحِبَ الطَّعَامِ ؟ ) قَالَ أَصَابَتْهُ السَّمَاءُ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: ( أَفَلَا جَعَلْتَهُ فَوْقَ الطَّعَامِ كَيْ يَرَاهُ النَّاسُ، مَنْ غَشَّ فَلَيْسَ مِنِّى) واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تێپەڕ بوو بەلای کۆمەڵێک خواردەمەنیدا دەستی تێخست و پەنجەکانی تەڕ بوون، فەرمووی: (ئەمە چییە ئەی خاوەنی خۆراک) ئەویش گوتی: باران لێی داوە ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: (ئەی نە ئەبوو تەڕەکەت بخستایەتە سەرەوە تا خەڵکی بیبینێت؟ هەر کەس غەش بکات لە ئێمە نییە.

وە (ئیمامی البيهقي ٢٠٨٥١) لە جابرەوە خودا لێی ڕازی بێت گێڕاویەتیەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)

فەرمووی: (انْطَلِقُوا بِنَا إِلَى الْبَصِيرِ الَّذِي فِي بَنِي وَاقِفٍ نَعُودُهُ) (وَكَانَ رَجُلًا أَعْمَى  صححه الألبانى فى "الصحيحة" ٥٢١) واتە: برۆ با برۆین بۆلای بینەر ئەوەی کە لە بەنی واقیفە و سەردانی دەکەین. جا مەبەسەی لەو ( بینەرە) پیاوێک بوو کە نابینا بوو!!

ئیمامی النسائي ١٤١٤) لە (عبداللەی کوڕی ئیبن ئەوفاوە) خوا لێی ڕازی بێت گێڕاویەتیەوە و دەڵێت: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (W) يُكْثِرُ الذِّكْرَ، وَيُقِلُّ اللَّغْوَ، وَيُطِيلُ الصَّلَاةَ، وَيُقَصِّرُ الْخُطْبَةَ، وَلَا يَأْنَفُ أَنْ يَمْشِيَ مَعَ الْأَرْمَلَةِ، وَالْمِسْكِينِ فَيَقْضِيَ لَهُ الْحَاجَةَ. (صححه الألباني في " صحيح النسائي) واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) زۆر زیکری دەکرد، و قسەی کەم دەکرد و نوێژی درێژ دەکردەوە و خوتبەی کورت دەکردەوە، هەرگیز لەوە بێزار نەدەبوو لەگەڵ بێوەژن و هەژاردا بڕوات و پێویستیەکەی بۆ جێبەجێ بکات.

وەکاتێ شەو بهاتایە و نوێژی عیشای بۆ خەڵک بکردایە، گەر شتێکی گرنگ هەبووایە لە کاروباری موسوڵمانان لەگەڵ گەورە هاوەڵاندا سەرقاڵ دەبوو پێوەی، گەر نا هەندێ کاتی لەگەڵ خێزانەکانیدا بەسەر دەبرد و قسە و حیکایەتی دەکرد. (ئیمامی أحمد ١٧٨ ، والترمذي ١٦٩) ابن

کثیر دەڵێت: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕەوشتی وا بوو هەڵس و کەوتی خۆش بوو و بەردەوام موژدە دەر بوو و گاڵتەی لەگەڵ خێزانەکانیدا دەکرد و بەزەیی پێدا دەهاتنەوە و نەفەقەی بۆ فراوان دەکردن و لەگەڵیان پێ دەکەنی و هەموو شەوێک خێزانەکانی لەو ماڵەدا کۆ دەبوونەوە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تیایدا دەمایەوە، هەندێ جار نانی ئێوارەی لەگەڵ دەخواردن، دواتر هەریەکە دەچووە بۆ ماڵی خۆی، لەسەر یەک جێگا لەگەڵ خێزانیدا دەنوست و بەتەنها جلی لای خوارەوە دەنوست و جلی سەرەوەی دادەنا، کاتێ نوێژی عیشای بکردایە هەندێ قسەی لەگەڵ خێزانەکانیدا دەکرد، دواتر دەنوست، بەوە دڵی خۆش دەکردن (تفسیر ابن کثیر ٢٤٢/٢) دواتر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە سەرەتای شەودا دەنوست، پاشان هەڵدەستا بۆ شەو نوێژ، ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بووایە نوێژی دەکرد، تاوەکو بیلال بانگی دەدا بۆ نوێژی بەیانی دوو ڕکات نوێژی دەکرد دواتر دەچوو بۆ نوێژ.

(ئیمامی أبو داود ٥٦) لە عائیشەوە وا لێی ڕازی بێت گێڕاویەتیەوە ودەڵێت: (أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ يُوضَعُ لَهُ وَضُوءُهُ وَسِوَاكُهُ، فَإِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ تَخَلَّى ثُمَّ اسْتَاكَ) واتە: (پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئاوی دەست نوێژی بۆ دادەنرا لەگەڵ

سیواکەکەیدا، گەر شەو هەستایە بۆ نوێژ سەرئاوی دەکرد و پاشان سیواکی دەکردوە، (عەبدوڵڵەی کوڕی عەباس) خودا لێی ڕازی بێت گێڕاویەتیەوە و دەڵێت: (بِتُّ عِنْدَ خَالَتِی مَيْمُونَةَ ، فَتَحَدَّثَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مَعَ أَهْلِهِ سَاعَةً، ثُمَّ رَقَدَ، فَلَمَّا كَانَ ثُلُثُ اللَّيْلِ الآخِرُ، قَعَدَ فَنَظَرَ إِلَى السَّمَاءِ، فَقَالَ: ( إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الأَلْبَابِ، ثُمَّ قَامَ فَتَوَضَّأَ وَاسْتَنَّ فَصَلَّى إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً، ثُمَّ أَذَّنَ بِلاَلٌ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى الصُّبْحَ) (رواه البخاري ٤٥٦٩، ومسلم ٧٦٣) واتە: (لەلای پورم میموونە کە خوشکی دایکم بوو مامەوە، ماوەیەک پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ خێزانەکەیدا قسەی کرد، پاشان نوست، کاتێ کەسێ یەکی شەو هات، هەستا و تەماشای ئاسمانی کرد، فەرمووی: (إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الأَلْبَابِ) بە دڵنیایی لە دروست کردنی ئاسمانەکان و زەویەکان و جیاوازی نێوان شەو و ڕۆژ لە تاریکی و ڕووناکی و لە کورتی و درێژی و لە ساردی و گەرمی و لە هێمنی و ئارامی و قەرەباڵغی، ئەمانە هەمووی بەڵگەی ڕوون و ئاشکران لەسەر تاک و تەنهایی و توانا و دەسەڵاتی خوای گەورە بۆ کەسانێک کە خاوەنی عەقڵێکی ڕاست و

ساغ و سەلیم و تەواو بن)  هەستا و دەست نوێژی شوشت و دەمی بە سیواک پاک کردەوە و یازدە ڕکات نوێژی کرد، پاشان بیلال بانگی دا، دوو ڕکات نوێژی کرد و دواتر دەرچوو نوێژی بەیانی کرد.  ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ڕۆتینی سادە نەبوو، هەروەک هەندێک وا لێی تێ دەگەن، بەڵکو کارێکی مەبەست دار بوو و پیرۆز بوو، هەروەک پەروەدگاری فەرمانی پێ کردووە: (قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ) (الأنعام ١٦٢) واتە: (ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) پێیان بڵێ: نوێژ کردن و حەیوان سەربڕین و ژیان و مردنم بۆ الله یە کە پەروەردگاری هەموو جیهانە، چۆن نوێژ کردن بۆ غەیری خوا شەریک دانانە، حەیوان سەربڕینیش بۆ غەیری خوا و ناوی غەیری خوای لەسەر بێنی ئەویش هەر شەریک دانانە، بۆیە خوای گەورە بەیەکەوە هێناویەتیەوە، وە تەنها بۆ خوا ئەژیم وە لە پێناو خوای گەورەشدا ئەمرم)

ژیانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) جێبەجێ کردنی فەرمانانی خودا بوو لەواقع دا، هەروەک عائیشە خوا لێی ڕازی بێت گێڕاویەتیەوە، (ئیمامی مسلم لە صەحیحەکەیدا ٧٤٦) لە سەعدی کوڕی هیشامی کوڕی عامرەوە گێڕاویەتیەوە و دەڵێت: بە عائیشەم گوت: (يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ؛ أَنْبِئِينِي عَنْ خُلُقِ رَسُولِ

اللهِ (صلى الله عليه وسلم)؟ قَالَتْ: أَلَسْتَ تَقْرَأُ الْقُرْآنَ؟ قُلْتُ: بَلَى !! قَالَتْ: فَإِنَّ خُلُقَ نَبِيِّ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ الْقُرْآنَ. واته: ئەی دایکی باوەڕداران هەواڵی ژیانی پێغەمبەری خودام (صلى الله عليه وسلم) پێ دەدەیت؟
گوتی: ئایا تۆ قورئان ناخوێنیت؟
گوتم: بەڵێ!
گوتی: ڕەوشتی پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) قورئان بوو.
والله أعلم.

# هەژاری

هەرگیز وا هەست مەکە ئەو کەسانەی خاوەنی پارە و باری گوزەرانیان باشە، کەسانی خۆشگوزەران و دڵشادن، چونکە ماڵی دونیا دەلالەت لە خۆشبەختی و کامەرانی ناکەن، لەوەیە ڕۆژێک لە ڕۆژان کەسێکمان بینیبێت، کە خاوەنی ماڵی دونیا بووە، وامان هەست کردبێت کە ئەم کەسە خاوەنی دڵخۆشیەکی ڕادەبەدەرە، بەوەی کە ئەو شتانەی هەیە کە ئێمە نیمانە، نەخێر بە تەواوی ئەم بۆچوونە هەڵەیە.

توێژینەوەیەک سەلماندویەتی کە ٨٠٪ ئەو کەسانەی دەڵەمەندن خاوەنی نەخۆشی دەرونین، بەدەست جەنجاڵی ژیانەوە دەناڵێنن. هەمیشە بە بەشی خودا ڕازیبە، بەوە ڕازیبە کە خودا لەم ژیانە کورتەتدا بۆی داناوین، چونکە من و تۆ ناوانین کە چی گونجاوە بۆ ئێمە. پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: تەماشای بەهەشتم کرد، زۆربەیان هەژارەکان بوون. بۆیە هەرگیز بێ هیوا مەبە، دڵنیابە خۆشی دەوێیت، دڵنیابە تاقیتدەکاتەوە دەیەوێت دڵخۆشت بکات، خودا دەتوانێ بە یەک چاو تروکاندنت، ئاواتەکانت بهێنێتە دیی، بەڵام چاوەڕێت دەکات، تا بزانێت ئارام گریت تاکەیە. وەڵا تۆی دروست کرد تۆی کردووە بە مرۆڤ

لەو هەموو ئاژەڵ و ڕووەکە، کە تۆی لە تۆیەکی بچوک دروست کردووە، کە بە چاو نابینرێت، تۆی کردووە بە مرۆڤێکی کامڵ، زۆربەمانی بە لەشساغی دروست کردووە و قەدری نازانین.! پیرەپیاوێک تەمەنی ٧٠ساڵ بوو چاوی ژانی دەکرد، چوو بۆ لای دکتۆر تا چاوی بپشکنێت و بزانێت چیەتی، کاتێک دکتۆر فەحسی کرد وتی: مام حاجی تۆ پێویستت بە عەمەلیاتێکە ٢ ملوێنی تێ دەچێت! پیرەپیاوەکە دەستی بە گریان کرد، دکتۆرەکان وتیان: چیە مامە گیان بۆ دەگری! هەر دەگریا، دکتۆرەکە وتی: مامە گیان گەر زۆرە بۆت دەکەینە نیوە! هەر دەگریا، دکتۆرەکان ئەوەی لەو شوێنەبوو دەستی بە گریان کرد، دکتۆرەکە وتی: مامە گیان گەر ئەوەشت نیە خۆم بۆت دەدەم! پیرەپیاوەکە وتی: دکتۆر من بۆ پارەکە ناگریم، وتیان ئەی بۆ دەگری!!! وتی: من تەمەنم ٧٠ ساڵە، خودا لەو ڕۆژەی منی دروست کرد، ڕۆژێک پارچەیە وەرەقەیەک، شتێکی بۆم نەنارد بڵێت: ئەمە حیسابی چاوەکەی تۆیە، کەچی من بەس بۆ یەک نەشتەرگری دەبێت ئەو برە پارەیە بدەم. بۆیە هەردەم شوکری خودا بکە لەو بەشەی حودا پێتی بەخشیوە، لەوەشی کە لێتی وەرگرتۆتەوە. جارێکیان پیاوێک چوو بۆ لای پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویی: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زۆرم

خۆشدەوێیت، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: دووبارەی بکەوە، پیاوەکە دووبارەی کردەوە، پیغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ جاری سێیەم فەرمووی: دووبارەی بکەوە، ئەویش دووبارەی کردەوە، وتی: زۆرم خۆشەوێیت، پێغەمبەری خوداش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویی: مادەم منت خۆشدەوێت خۆت ئامادە بکە بۆ هەژاری. ئێمە دەبێت بزانین هەژاری نیعمەتی خودایە، خودا هەژارەکانی خۆش دەوێت، زۆر بەی ئەهلی بەهەشت هەژارەکانن. پێغەمبەری خوداش هەژار بووە جاری وا بووە کە بە چەند ڕۆژ ئاگر لە ماڵیدا نەکراوەتەوە. (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِأَزْوَاجِكَ إِنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا) (الأحزاب ٢٨) کاتێک کە خێزانەکانی پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) داوای نەفەقەیان کرد، چونکە زۆر هەژار و نەبوون بوون، (ئیمامی ئەبو بەکر) هەڵسایە گیان (عائیشە)ی کچی لێیبدات و (ئیمامی عومەر)یش هەڵسایە گیان (حەفسە)ی کچی لێیبدات، وتیان داوای شتێک لە پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) دەکەن کە نیەتی،! بەڵام پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) نەیهێشت و بەرهەڵستی کردن، ئەوانیش وتیان سوێند بە خودای گەورە لەمەودوا داوای شتێک لە پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) ناکەین کە نەیبێت، وە خودای گەورە ئەم ئایەتەی

دابەزاند و سەرپشکی کردن لە نێوان دونیا و دوارۆژدا (الصحیح المُسنَد): ئەی پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) بە خێزانەکانت بڵێ: ئەگەر ئێوە جوانی و ڕازاوەیی ژیانی دونیاتان دەوێ، وەرن با تەلاقتان بدەم واتە: ئەوەی کە ئەتانەوێ پێتان ئەبەخشم بەڵام لێتان جیا ئەبمەوە و تەلاقتان ئەدەم و بۆ خۆتان بڕۆن و دوای دونیا بکەون.

(وَإِنْ كُنتُنَّ تُرِدْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الْآخِرَةَ) وە ئەگەر ئێوە خودا و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و قیامەتتان ئەوێ واتە: بەهەشتان ئەوێ (فَإِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَاتِ مِنْكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ) ( الأحزاب ٢٩) ئەوە بەدڵنیایی خودای گەورە بۆ چاکەکاران لە ئێوە ئەجر و پاداشتێکی یەکجار گەورەی داناوە، پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) یەک یەک خێزانەکانی سەرپشک کردوو لە (عائیشە)وە دەستی پێکردوو فەرمووی: ئەی (عائیشە) شتێکت پێ دەڵێم بەڵام پەلە مەکە لە بڕیارداندا تا ڕاوێژ بە دایک و باوکت دەکەیت، (دەیزانی دایک و باوکی رازی نابن عائیشە واز لە پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) بێنێت و پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) خۆیشی پێی خۆش نەبوو)، (عائیشە) فەرمووی: لەم شتەدا ڕاوێژ بەکەس ناکەم و من خودا و پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) و بەهەشتم دەوێت، پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) زۆر دڵخۆش بوو، پاشان

خێزانەکانی تریشی هەر هەموویان خودای گەورە و پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) و بەهەشتیان هەڵبژارد و خۆشی ژیانی دونیایان ڕەت کردەوە، کە نۆ خێزانی هەبوو کە: (عائیشە و حەفصە و ئوم حەبیبە و سەودە و ئوم سەلەمە و صەفیە و مەیمونە و زەینەبی کچی جەحش و جوەیرییە) بوون. گریمان هەژاری ڕوی تێکردی یان ئەگەر توشی ناڕەحەتی و موصیبەتێک بویت سوننەت وایە بڵێت: لە دایکی مەیمەنەوە دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت (ما من مسلم تصيبه مُصِيبَةٌ فيقول ماامره الله إِنَّا للهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ، اللَّهُمَّ أَجُرْنِى فِى مُصِيبَتِى وَاخْلِفْ لِى خَيْرًا مِنْهَا) الا أخلف الله له خيرا منها) (روايه مسلم ٩١٨) واتە: (ئێمە موڵکی خوداین و هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە، خودایە پاداشتم بدەرەوە لەم موسیبەتەدا و شتێکی باشترم بۆ بکەرەوە شوێنی) هەرکەسێک ئەمە بخوێنێت، خودای پەروەردگار پاداشتی دەداتەوە، لەسەر ئەو ناڕەحەتیەی کە تێی کەوتووە و ناڕەحەتیەکەشی بۆ پڕ دەکاتەوە بە
شتێکی باشتر لەوە.

کاتێک کە ئەبوو سەلەمە خودا لێی ڕازیبێت کە لە جیهادا شەهید کرا، هەواڵ بۆ ئموو سەلەمە هات، کە ئەبو سەلەمە وەفاتی کردووە، ئموو سەلەمە فەرمووی: وەڵا

ڕۆژێک گوێم لە پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) بوو، کە هەر کاتێک توشی بەڵایەک یان موسیبەتێک بوون، ئەوا بڵێن (إِنَّا للهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ) لە خەیاڵی خۆمدا وتم من خێزانی سەحابەیەکم ئەبێ لە دوای ئەو کێ ببێتە هاوسەری ژیانم! کە ئەم دوو کەسە لە کاتی هیجرەتی پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) بۆ مەدینە کاتێک کە ویستیان هیجرەت بکەن، کەسوکاری هەردولایان هێندە باڵیان ڕاکێشا بوو قۆڵی سەلەمە دەرچوو بوو! ئموو سەلەمە دەفەرموێت: پاش ماوەیەک پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) هات بۆماڵم و لە دەرگایدا، داوای یارمەتی کرد بێتە ژورەوە، دانیشت و خوازبێنیمی کرد، وتم ئەی پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) من پیر بوومە دەستەکانم تێکچوونە! پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: منیش پیر بوومە و دەستەکانم تێک چوونە، ئموو سەلەمە وتی: لە خۆشیدا فرمێسک بە چاوەکانمدا هاتنە خوارەوە، ئەو کاتەم بیرکەوتەوە کە هەواڵی ئبوو سەلەمەیان پێم گوتبوو، کە ئەو زیکرەم خوێند بە یەقینەوە پێشوتر خێزانی سەحابەیەک بووم ئێستا خێزانی پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم)مم. بۆیە تکام وایە لە هەر بەڵا و موسیبەتێک لە ژیانمان بەسەرمان دێت، باشتر وایە بلێین (إِنَّا للهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ)

# یادی خودا

خاڵێکی زۆر گرنگ کە پاداشت و خێرێکی زۆر گەورەی هەیە، ئەویش یاد و زیکری خودایە، بۆیە با دڵەکانمان پەیوەست بکەین بە زیکری خوداوە، بۆ ئەوەی ئەو دڵە ڕەشانەمان بە یادی خوداوە بتوانین پاکی بکەینەوە. زیکرەکان پەیوەندیمان لەگەڵ خودا زیاتر نزیک دەکانەوە، زیاتر هەست بە بوونی خۆمان دەکەین، زیاتر هەست بە دڵخۆشی و ئارامی دەکەین، دڵنیابە گەر دڵێک بە تەواوی پەیوەست بێت بە خودای گەورەوە، ئەوا ئەو کەسە خۆشبەخترین کەسی دونیا دەبێت.

پەروەرێن دەفەرموویێت: (الَّذِينَ آمَنُوا وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ اللَّهِ أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ) ( الرعد ٢٨) واتە: (ئەوانەی باوەڕیان هیناوە و دڵ و دەروونیان ئارام دەبێت بە قورئان و پەیامەکەی خودای پەروەردگار، ئاگاداربن دڵەکان هەر بە قورئان و یادی خودا و (پاپەندبوون بە ئاینەکەیەوە) خۆشنوود دەبن و دەحەوێنەوە) بەڵام گەر دڵێک تەواو پەیوەست بێت بە گۆرانیەوە هەرگیز یاد و زیکری خودا ناچێت بە دڵیدا چونکە لە دڵێکدا جێگای گۆرانی و زیکری خودا نابێتەوە، بۆیە تا پێمان دەکرێت

دووركەوینەوە لەو كارانەی كە دڵەكانمان بەرەو خەم و خەفەتدا دەبات.

چەند زیكرێک هەن كە وەک گەنجینەوان بۆمان ئەوەندە خێریان زۆرە بۆیە باهەوڵبدەین دڵەكان و بیر و هۆشمان پەیوەست بكەین بەم زیكرانەوە چونكە پاداشتی قیامەتی زۆرە.

١. {سبحان الله وبحمده} ١٠٠ جار بەیانیان و ئێواران، كاتەكەی زۆر كەمە، تەنها ٢ خولەكت پێدەچێت، هیچ كەسێک نیە لە ڕۆژی دوایدا بێت بە ئەندازەی ئەم كەسە كردەوەی باشی هەبێت، مەگەر كەسێک كە لەو زیاتری وتبێت.

٢. {رضيت بالله ربا وبالاسلام دينا ومحمد نبيا ورسولا} ٣ جار خوێندنی، كاتەكەی تەنها ١٥ چركەیە، پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: من كەفیل  و گرەنتی دەدەمێ كە دەستی بگرم تا دەیبەمە بەهەشتەوە.

٣. پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: (وعن أبي الدرداء قال قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): من صلى علي حين يصبح عشرا وحين يمسي عشرا أدركته شفاعتي يوم القيامة) (رواه الطبراني) واتە: ئەوەی بەیانی ١٠ صڵاوات و ئێواران ١٠ صڵاواتم بۆ بنێرێت، لە قیامەتدا بەر شەفاعەتم

دەکەوێت. کاتەکەشی تەنها نیو خولەکە. خوداش دەفەرمووێت: ئەی محەمەد هەر کەسێک ١ صلاوات لەسەرت لێبدات ئەوا من ١٠ صلاوات لەسەری دەدەم.

٤. (سبحان الله وبحمده) (سبحان الله العزیم) پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: ٢ وشە هەیە لەسەر زمان سوکن، بەڵام لە قیامەت زۆر گەورەن. ئەویش ئەم دوو زیکرەیە.

٥. (سبحان الله) ١٠٠ جار بەیانیان ١٠٠ جار ئیواران کاتەکەی تەنها یەک خولەک و نیوە. کە ئەم زیکرە خێری زیاترە لەوەی کە ١٠٠ حوشتر بکەیت بەخێر.

٦. (الحمد الله) بەیانیان١٠٠ جار و ئێواران١٠٠ جار کاتەکەی تەنها یەک خولەک و نیوە. خوێندنی ئەم زیکرە باشترە لەوەی ١٠٠ ئەسپ بە تفاق و کەرەستەی جەنگی لە ڕێی خودا ببەخشێت.

٧. (سبحان الله عدد خلقيه ورضا نفسه وزنة عرشه ومداد كلماته) ٣ جار خوێندنی، ئەم زیکرە کاتەکەی تەنها یەک خولەک و نیوە. جورەیری خیزانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەدوای نوێژی بەیانی هەتا چێشتەنگاو زیکری دەکرد پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەم چوار وشەیەی٣ جار دووبارە کردەوە وەفەرمووی: من بە ئەندازەی تۆ بۆم نوسرا.

٨. (لاإله إلا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد وهو علي كل شيء قدير)١٠ جار بەبانیان و ئێواران، کاتەکەی تەنها خولەکێکە ١٠ چاکەت بۆ دەنوسێت و ١٠ گوناهت لێ هەڵدەوەرێت و ١٠ پلە بەرز دەبیتەوە و خێری ئازاد کردنی ٢ کۆیلەت بۆ دەنوسرێت.

٩. (سورەتی الاخلاص) کاتەکەی یەک خولەک و نیوە بەیانیان ٣ جار و ئێواران ٣ جار خودای گەورە لە شەڕی شەیتان دەتپارێزێت لەو شەو ڕۆژەدا.

١٠. (الله اکبر) کاتەکەی ١ خولەک و نیوە بەیانیان ١٠٠ جار و ئێواران ١٠٠ جار ئەوەی ئەم زیکرە بخوێنێ باشترە لەوەی ١٠٠ بەندە ئازاد بکات.

١١. (لا إله إلا الله وحده لاشريك له، له الملك وله الحمد،يحيى ويميت، وهو حی لايموت، بيده الخير و هو على كل شئ قدير)

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: هەر کەسێک کە چوو بۆ بازاڕ ئەم دوعایە بخوێنێت، ملوێنێک چاکەی بۆ دەنوسرێت و ملوێنێک گوناحی لێ هەڵدەوەرێ، وە ملوێنێک پلەی بەرز دەبێتەوە، وەهەروەها ماڵێکی لە بەهەشت بۆ دروست دەکرێت.

کەوایە با دەممان ڕابێنین لەسەر ئەم زیکرانە، بەڵکو

ئەمانە لە دونیا و لە قیامەت سودمان پێ بگەیەن، بۆیە با دەس بگرین بە یادی خوداوە، چونکە زیکرەکان نزیکمان دەکەنەوە لەو بەهەشتەی کە خودا ئامادەی کردووە بۆ باوەڕداران، کاتێکی کەم و پاداشتێکی زۆر بەدەست دەهێنین.

## ١٠٪ قازانجەکەت بۆ خودا دابنێ

ئەو پیاوەی لەکاتی مردنی نیو ملیۆن کەس لەدوای جەنازەکەی ئەرۆیشتن!!..

صلاح عطية: لە ژیانیدا جل و بەرگی نوێی لەبەر نەکرد مەگەر کۆن و بەکارهێنراو نەبێت، ژمارەی پێڵاوەکانی پێی ٤٢ە بەڵام ٤٤ لەپێ دەکات، چونکە باوکی وای فێرکردووە کە حیساب بۆ ساڵانی داهاتوو بکات، چونکە ئەو نەیدەتوانی هەمووساڵێک پێڵاوی بۆ بکرێت. لە شارۆچکەیەکی بچوک دەژیا کەناوی ( تفهمنا الاشراف) بوو، سەربە ناوەندی (میت غمر) ی سەربە پارێزگای (الدقهلية) لە وڵاتی میسر.

ئەندازیار صلاح بڕیاری جێبەجێکردنی پڕۆژەیەکی بچوکی دا لە گەڵ ٨ کەسی تر، لە دێیەکەیان کە هەر نۆیان کۆلێجی کشتوکاڵیان تەواو کردبوو، لەوپەڕی هەژاری و دەست کورتیدا بوون و دەیان ویست دەست بە ژیانی خۆیان بکەن، لەبەر ئەوە بیریان لە پرۆژەیەکی بەخێوکردنی پەلەوەر کردەوە. دەست پێکردنی پرۆژەکە پیویستی بە ٢٠٠٠ جونەیهی میسری بوو، ئەوانیش ٩ کەس بوون، لەبەر ئەوە بەدوای کەسی دەیەمدا گەڕان

تاکو هەریەک بە ٢٠٠ جونەیە بەشدار بێت، بەڵام بێ سوود بوو، کەسی دەیەمیان دەست نەکەوت.

لێرەدا ئەندازیار صلاح عطية ووتی کەسی دەیەمم دۆزییەوە.

ئەوانی تر بەیەک دەنگ وتیان کێیە؟

ئەویش ووتی: ئەو (الله) یە.

ئەو لەگەڵمان دەبێت بە هاوبەش و لە ١٠ بەش لە قازانج بەشێک بۆ ئەو دەبێت واتە ١٠٪ لە بەرامبەردا ئەو دەمانپارێزێت و لە پەنای ئەودا دەبین لە زیان و نەخۆشی و ئافات، ئەوانی تریش بەمە ڕازی بوون. خولی یەکەمی پرۆژەکە تەواو بوو.

ئەنجام: قازانجێکی بێ وێنە و بەرهەمێک کەلەمەو بەر ڕووینەداوە و هەرگێز چاوەڕوان نەکرابوو.

خولی دووەم لە پرۆژەکە: هاوبەشەکان (شەریکەکان) بڕیاریاندا پشکی هاوبەشی دەیەم (الله) بەرز بکەنەوە بۆ ٢٠٪ هەربەم جۆرە هەموو ساڵێک پشکی هاوبەشی دەیەم (الله) بەرزدەبێتەوە تاکو گەیشتە ٥٠٪.

ئەی قازانجەکانی هاوبەشی دەیەم (الله) چۆن خەرج دەکرێت ؟

پەیمانگایەکی ئایینی بۆ قواتبیانی سەرەتایی دروست کرا،

دوای پەیمانگایەکی تری سەرەتایی، ئەمجا پەیمانگایەکی ئایینی بۆ قوتابیانی ئامادەیی بۆ کوڕان، دواتر یەکێکی تری ئامادەیی بۆ کچان.

دوایی پەیمانگایەکی ناوەندی بۆ کوڕان، ئینجا یەکی تر بۆ کچان.

لەبەر ئەوەی قازانجەکە بەردەوام لە زیادبووندا بوو (بەیتولمال) ی موسڵمان دانرا و بیر لە دامەزراندنی کۆلێج کرایەوە، لە کوێش؟ لە دێیەکەیان. داواکاری پیشکەش کرا بۆ لایەنی پەیوەنددار، بەڵام ڕەزامەندی نەدرا، چونکە ئەوێ تەنها دێیە و ویستگەی شەمەندەفەری تیا نیە و کولێجیش دەبێت تەنها لە شاردا بێت. دووبارە داواکاری پێشکەش کرا، کە هەموو شتێک لەسەر خۆیان دەبێت و وێستگەی شەمەندەفەریش هەرخۆیان دروستی دەکەن، ئەمجارە ڕازی بوون. بۆ یەکەمجار لە مێژووی میسردا کۆلێجێک لە دێیەکدا دروست کرا و دوایی بوو بە دوو و ئەمجا سێ و پاشان چوار.

ماڵی قوتابیان ( بەشی ناوخۆ) دروست کرا بۆ کچان کە جیگای ٦٠٠ قوتابی تیدا ببێتەوە. ماڵی قوتابیان بۆ کوڕان دروست کرا، کە جێی ١٠٠٠ قوتابی تێدابوو، ئەمە هەمووی دەزانن لە کوێ؟ لە دێیەکدا. ئەنجا وێستگەی

شەمەندەفەر دروست کرا و هەر قوتابیەکی ئەو کۆلێجانە تکتی خۆی پێدرا تاکو بتوانێ بە خۆڕایی سوار بێت و بگاتە کۆلێجەکەی، ئەمەش وەک ئاسانکاری بۆ هات و چۆی قوتابی.

بەهۆی (بيت المال المسلمين) يشەوە یەک ماڵە هەژار لە دێدا نەما.

دوایی ئەم ئەزموونە گواسترایەوە بۆ دێیەکانی تری نزیک. ئەندازیار صلاح سەری لە هیچ دێیەک نەدا و بەجێی نەهێشت بەرلەوەی (بيت المال المسلمين) ێکی تیا دانەمەزرێنێ. یارمەتی هاوکاری گەیشتە هەژار و بیوەژن و گەنجی بێکار، تاکو پرۆژەی خۆیان هەبێت و دووریان خاتەوە لە نەبوونی و هەژاری. سەوزە و میوە ناردرا بۆ وڵاتانی دراوسێ، ڕۆژی کۆکردنەوەی بەرهەم هەرماڵێکی دێیەکە، تەنانەت ئەوانەی خەڵکی ئەوێش نین بەشی خۆیان بە دیاری دەدرێتێ لە گەورە تا بچوک. ڕۆژی یەکەمی هەموو ڕەمەزانیک بۆ کاتی فتارکردن، هەرماڵێک خواردنی خۆیان دروست دەکەن و دەیهێنن لە گۆڕەپانی دێیەکە دایدەنێن و هەموو پێکەوە فتار دەکەن، تەنانەت ئەوانەش کەلەوێن میوانن یا بۆ ئیش و کار هاتوون. کچە بی باوکەکان هەموو پێداویستی بە شوودانیان بۆ دابین

دەکرێت.

لە کۆتاییدا بڕیاردرا کە هەموو پڕۆژەکە بۆ کەسی دەیەم (الله) بێت و ئەوان تەنها فەرمانبەر بن لەلای ئەو. ئەندازیار صلاح بووە فەرمانبەرێک لەلای ( الله سبحانە وتعالی) مووچەکەی لەو وەردەگرت بەڵام داوای لە (الله) کرد کە هەرگیز پێویستیان بە جگە لەو نەبێت و تەنها بە ئەو هەژاربن.

ئەندازیار صلاح عطیە گەڕایەوە لای بەزەیی (الله) و زیاتر لە نیو ملیۆن کەس بە دوای جەنازەکەیدا ڕۆیشتن.

ڕەحمەتی (خوای لێبێت) صلاح عطیة. با ئیمەش لەکارەکانمان ١٠٪ لە قازانجەکانمان بدینە (الله) تا خودای گەورە لە هەردوو دونیا فریامان بکەوێت.

## چاكە ئەنجام بدە

عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ، حَدَّثَنِى أَبِى قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) (أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَكْسِبَ، كُلَّ يَوْمٍ أَلْفَ حَسَنَةٍ؟) فَسَأَلَهُ سَائِلٌ مِنْ جُلَسَائِهِ: كَيْفَ يَكْسِبُ أَحَدُنَا أَلْفَ حَسَنَةٍ؟ قَالَ (يُسَبِّحُ مِائَةَ تَسْبِيحَةٍ، فَيُكْتَبُ لَهُ أَلْفُ حَسَنَةٍ، أَوْ يُحَطُّ عَنْهُ أَلْفُ خَطِيئَةٍ) (رواه مسلم ٢٦٩٨)

واتە: (كەسێک هەيە لە ئێوە نەتوانێ هەموو ڕۆژێک هەزار چاكە بكات؟) پرسياركەرێک لە مەجليسەكەی پرسياری كرد: چۆن يەكێک لە ئێمە هەزار چاكە بە دەست دێنێ؟ فەرمووی: ١٠٠ جار (سبحانه الله) بكات، هەزار چاكەی بۆ دەنووسرێ، يان هەزار گوناهی لێ هەڵدەوەرێ) هەموو موسڵمانێک خێر كردنی لەسەرە. (حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِى بُرْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، عَنِ النَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ (عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ صَدَقَةٌ)، فَقَالُوا: يَا نَبِىَّ اللَّهِ، فَمَنْ لَمْ يَجِدْ؟ قَالَ (يَعْمَلُ بِيَدِهِ، فَيَنْفَعُ نَفْسَهُ وَيَتَصَدَّقُ) قَالُوا: فَإِنْ لَمْ يَجِدْ؟ قَالَ (يُعِينُ ذَا الحَاجَةِ المَلْهُوفَ) قَالُوا: فَإِنْ لَمْ يَجِدْ؟ قَالَ (فَلْيَعْمَلْ بِالْمَعْرُوفِ، وَلْيُمْسِكْ عَنِ الشَّرِّ، فَإِنَّهَا لَهُ صَدَقَةٌ) (رواه البخاري ١٤٤٥) واتە: (هەموو موسڵمانێک خێركردنی لە سەرە) وتيان ئەی پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) ئەی ئەگەر نەيبوو؟ فەرمووی: (با بە دەستی خۆی ئيش

بكات سوود بە خۆی بگەیەنێت و خێر بكات) وتیان: ئەی ئەگەر نەیتوانی؟ فەرمووی: (با یارمەتی خاوەن پێداویستیەكان بدات) وتیان: ئەی ئەگەر نەیتوانی؟ فەرمووی: (با كاری چاك بكات و خۆی لە خراپە بە دوور بگرێ ئەوە خێرە بۆی) واتە: ئەگەر نەتتوانی كاری چاك بكەی ئەوا خۆت لە خراپە بە دوور بگرە، ئەوە خۆی لە خۆیدا بە خێر بۆت دەنووسرێ. پاداشتی خۆشەویستی لەبەر خاتری خوا لە ئەنەسەوە ڕەزای خوای لێبێت كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: پیاوێك سەردانی برادەرێكی خۆی كرد لە گوندێكدا، جا خوای گەورە فریشتەیەكی نارد بۆ سەر ڕێگاكەی و كاتێك هات بۆ لای پێی وت: بۆ كوێ دەچیت؟ ئەویش وتی: بۆ لای برادەرێكم دەچم لەم گوندەدا. فریشتەكە وتی: ئایا هیچ مافێكی دنیایيت بە سەریەوە هەیە لێی وەرگریتەوە، یان هیچ بەرژەوەندیەكت هەیە لە گەڵیدا پێی هەڵبسیت؟

ئەویش وتی: نەخێر، تەنها ئەوە نەبێت كە من لەبەر خوا خۆشم دەوێت.

فریشتەكەش وتی: جا من نێردراوی خوام بۆ لای تۆ، بۆ ئەوەی ئاگادارت بكەمەوە كەوا خوداش تۆی خۆش دەوێت، وەك چۆن تۆ ئەوت خۆش دەوێت لەبەر خاتری خودا.

# نوێژ

نوێژ به عەرەبی: (الصلاة)٢ـەم بنەمای ئیسلامە، بە گەڕانەوە بۆ ئەم فەرموودەیەی (پێغەمبەر محەمەد) (صلى الله عليه وسلم) کاتێ دەفەرموویت: (بُنِیَ الإِسْلاَمُ عَلَى خَمْسٍ شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاّ اللّهُ وَأَنّ مُحَمّداً رَسُولُ اللّهِ، وَإِقَامِ الصّلاَةِ، وَإِيتَاءِ الزّكَاةِ، وَالْحَجِّ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ) واتە: (ئیسلام لەسەر پێنج پایە دامەزراوە: شایەتی دان بەوەی کەوا هیچ پەرستراویک نییە شایەنی پەرستن بێت بەڕاستی جگە لە الله، وە موحەممەدیش نێرراو و پێغەمبەری الله یە، و نویژ کردن، و زەکات دان، و حەج کردنی ماڵی خودا، و ڕۆژوو گرتنی ڕەمەزانە) نوێژ فەڕزە پێویستە لەسەر هەموو مسوڵمانێکی ژن و پیاو، و پێویستە لەسەریان ئەو فەرزە لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا بەجێ بهێنن. و فەڕزکرا لە مەککە پێش کۆچکردنی پێغەمبەر بۆ مەدینە لە ساڵی دەیەمی پێغەمبەرایەتیدا، ئەمەش لە کاتی ئیسرا و میعراجدا بوو. لە ئیسلامدا ڕۆژانە ٥ نوێژ فەڕزە لەسەر موسڵمانان، هەروەها چەند جۆرێکی تری نوێژ هەیە وەک: نویژی جەژن و نوێژە بارانە و نوێژی مردوو و نوێژی خۆرگیران و نوێژی

مانگیران و نوێژی مەرام. ئیسلام پایەیەکی داوە بە نوێژ کە نەیداوە بە هیچ پەرستنێکی تر، یەکەم ئەرکە کە خودا فەڕزی کردووە لە پەرستنەکاندا، وەلە شەوی میعراجدا فەڕز کراوە، هەروەها پێغەمبەر فەرموویەتی یەکەم شت مرۆڤ لێیدەپرسرێتەوە لەسەری لە ڕۆژی دواییدا نوێژە، هەروەها نویژ لە چەند جێگەیەکدا لە قورئاندا باس کراوە وەک لە سورەتی موئمنون (قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ. الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ) (موئمنون:١–٢) واتە: (بە ڕاستی ئەو بڕوادارانە سەرکەوتوو سەرفراز بوون، ئەوانەش ئەوانەن کە لە نوێژەکانیاندا ملکەچ و دڵ ئارام و دڵ دامەزراون و دڵیان لای خودایە) وەلە سوڕەتی کەوسەر هاتووە (فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ) (کەوسەر ٢) واتە: (کەواتە نوێژ تەنها لەبەر خودا و بۆ خودا و بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی پەروەردگارت ئەنجام بدە و قوربانیش بکە) وە لە سوڕەتی الأعلى دا هاتووە (وذكر اسم ربه فصلى) واتە: (ناوی پەروەردگاری خۆی هێنا، جا نوێژی کرد) هەروەها لە سورەتی تاها (وأقم الصلاة لذكرى) واتە: (نوێژەکانیشت بەچاکی ئەنجام بدە، تا هەمیشە منت لە یاد بێت) لە قورئاندا ئاماژەکراوە بەوەی (ان الصلاة كانت على المؤمنين كتابا موقوتا) (سورة النساء) واتە: چونکە

بەڕاستی نوێژ لەسەر ئیمانداران فەرزە لە کاتی دیاریکراودا دەبێ ئەنجام بدرێت. هەروەها هاتووە (وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ وَآتُواْ الزَّكَاةَ وَارْكَعُواْ مَعَ الرَّاكِعِينَ) (بەقەرە ٤٣) واتە: نوێژەکانتان بە چاکی ئەنجام بدەن بە دروشمەکانیەوە و زەکاتیش بدەن، لەگەڵ کڕنووش بەراندا کڕنووش ببەن (بۆ پەروەردگارتان) )نوێژ کۆڵەکەی ئاینە وهیچ پۆزشێک لەو کەسە وەرناگیرێت کە وازی لێ بهێنێت لە کاتێکدا لە توانایدا بێت ولەسەری بێت. دڵنیابە ئەوەی نوێژی نەکرد ئەوا دینی تەواو نیە لە ئیمانی دەردەچێت. ئەو کەسە هەرچی بکات لەم دونیایەدا بۆی گیرا نابێت، تەنانەت ڕۆژوش بگرێت وەک ئەوە وایە دەمی بەرازێکی گرت بێت. هاوەڵێکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وتی: پێغەمبەری خودا کەسێک زینا بکات و دزی بکات ئایا نوێژ بکات؟ فەرمووی: بەلی بابیکات. وتی: ڕەسوڵەڵە زینا و دزی! وتی: بەڵی. بۆ جارێ سێیەم وتی:! ئەی ڕەسوڵەڵە زینا و دزی! فەرمووی: بەڵی. ئەگەر هەرچەندە کارێک بکەیت، شتێکی حەرام دەخۆیت، زینا ئەنجام دەدەی، هەر چی گوناحێک دەکەیت نوێژەکانت ئەنجام بدە، چونکە نوێژ قسە کردنە لەگەڵ خودا، قسەکردنە لەگەل ئەو کەسەی کە تۆی گەیاندە ئەم ڕۆژە، تۆی لە مرۆڤێکی بچوک گەیاندە

ئەم ڕۆژە. کاتەکانی نوێژ لەسەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) ژمارەیان زۆر زیاتر بووە، لە شەوی ئیسرا و میعراجدا کەمکرایەوە بۆ ئەم ٥ فەرزە بەڵام هەمان خێری پێشووی هەیە، کە بە هەموویەوە نیو کاتژمێرمان پێناچێت، ئەو شێوازی نوێژکردنە کە ئەنجامی دەدەین، چەندەها سودی هەیە لە ڕووی تەندروستییەوە. هەروەها چارەکردنی کێشە دەروونییەکانی وەکو و توڕەیی و خەمۆکی، هاوکات ئازاری پشتیش کەمدەکاتەوە و لاستیکی بوونی زیاتر بە جومگەکان دەبەخشێت، ئەگەر بێتو بە شێوەیەکی ڕاست و دروست ئەنجامبدرێت. ئیستا لە وڵاتە پێشکەوتوەکانی ئەمریکا و چین، جیازێکیان دروست کردووە، لە شێوازی نویژ کردن لە شێوازی سوجدە بردن بۆ خودا، چونکە لە کاتی سوجدە بردندا ئاو دەچێتە ئەو خانەکانی بڕبڕەی پشت و ئازارەکانی پشت بە ئیزنی خودا چاک دەبێت. هەر لە کاتی سوجدەیە کەتێک ناوچەوان لەسەر زەوی دادەنێیت، لەو کاتەی کە سوجدەد بردووە هەوڵ مەدە چاوەکانت دابخەیت، چونکە کە چاو دەکرێتەوە لەکاتی سوجدە خوێن لە مێشکەوە دەچێت بۆ چاو، کە ئەمەش ئازاری چاو کەمدەکاتەوە، چاومان شەحن دەکاتەوە. بەڵام لەم ڕۆژەدا دەبینین کەسانی

موسڵمانن و کەسانی پێگەیشتوو دەبینین، غەلەت دەکەن لەناو نوێژدا دەبێ ئاگاداربین! نوێژنابێت غەڵەتی تێدا بکەین، نوێژ دەبێت بزانی بە چی شێوازێکی دروست ئەنجامی دەدەین بە شێوازی پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) ئەنجامی بدەین، چونکە هیچ کەس وەک ئەونیە کە کارەکانی لەو ڕاستر بێت. دەبینین کەسانێکی زۆر هەن کە هەڵە دەکەن لە نوێژدا، ئەو هەڵانەش بەرە بەرە بڵاودەبێتەوە، چونکە ژمارەی مسڵمانان لە زیادبوون دان بۆیە موسڵمانان دەبێت دان بەو هەڵانەی خۆیان بنێن و ئەنجامی نەدەن لە نوێژەکانیاندا. نوێژ نابێت بەپەلە و جرپە جرپ ئەنجام بدرێت، کە ئەمەش دەبێتە هۆی گیرانەبونی نوێژەکەت و بەتاڵ بوونەوەی. چەند مەرجێکی نوێژمان هەیە کە بەبێ ئەم مەرجانە ئەنجامدانی دروست نین.

* مەرجەکانی نوێژ

١. ئیسلام، واتە ئەو کەسە دەبێت مسوڵمان بێت، وە بە هیچ شێوەیەک نوێژی کافر وەرناگیرێت.

٢. عەقڵ، واتە ئەو کەسە لەگەڵ ئەوەدا کە مسوڵمانە دەبێت عەقڵیشی هەبێت واتە شێت نەبێت، چونکە بە هیچ شێوەیەک لەسەر کەسی بێ عەقڵ و شێت نوێژکردن

پێویست نیە.

٣. جودکاری لە نێوان پاک و خاوێنی، واتە لەگەڵ ئەوەدا ئەو کەسە دەبێت مسوڵمانێکی عاقڵ بێت، لە هەمان کاتیشدا نابێت منداڵ بێت، بتوانێت پاک و خاوێنی جیا بکاتەوە، بۆیە دەبێت ئەو کەسە گەیشتبێت بەو تەمەنەی کە بتوانێت ئەم مەرجە لە خۆیدا بهێنێتە دی.

٤. پاکڕاگری، کە دەست نویژ و خۆشتن و پاکڕاگرتنی جەستە و جل و جێگەی نوێژ ئەگرێتەوە.

٥. شاردنەوەی عەورەت.

٦. چوونە کاتی نوێژەوە، نوێژکردن لە کاتە دیاریکراوەکانی خۆیدا.

٧. ڕووکردنە قیبلە، لە هەموو لایەکی جیهانەوە، پێویستە لەسەر موسڵمان ڕووبکاتە قیبلە بۆ نوێژکردن و قیبلەش کەعبەی پیرۆزە لە شاری مەککە لە عەرەبستانی سعودیایە.

٨. نییەت، سەرچاوەی لە دڵەوە گرتووە، ئەمەش بە خۆ ئامادەکردن و بە مەبەستەوە هەڵدەستێت بەو نوێژە، بەڵام نیەت لە دڵەوەیە واتە بە زار ناوترێت.

## * ئەرکانەکانی نوێژ

١. وەستان بە پێی توانا و حاڵی ئەو کەسە ئەمەش لە

نوێژە فەرزەکاندا.

٢. تەکبیرەی ئیحرام واتە لە سەرەتای نوێژەکەدا پێویستە بوترێت (الله أکبر)

٣. خوێندنەوەی سورەتی فاتیحە ئەگەر بە تەنیا بوو، بەڵام ئەگەر لەگەڵ پێش نوێژدا نوێژی کرد خوێنەوەی پێش نوێژەکە بەسە.

٤. کوڕنوش بردن الرکوع.

٥. هەستانەوە لە کوڕنوش.

٦. هەستان و ڕاوەستان تا هەموو لەشت ڕێک دەبێتەوە.

٧. سوجدەکان.

٨. هەستانەوە لە سوجدەکان.

٩. دانیشتن لە نێوان سوجدەکان.

١٠. تەحیاتی کۆتایی

١١. دانیشتن بۆ سەلامدانەوە.

ئەگەر یەکێک واز لە یەکێک لەم ئەرکانانە بهێنێت و بزانێت بەبێ هیچ پۆزشێک نوێژەکەی بەتاڵ دەبێت و پێویستە دووبارەی بکاتەوە، بەڵام ئەگەر لێی تێک چوو ئەتوانێت سوجدەی سەهوو ببات.

## نوێژە سوننەتەکان (نوێژی جەنازە)

واتە: نوێژی مردوو، ئەم نوێژە حوکمەکەی فەرزی کیفایەتە، واتە: ئەگەر هەندێک لە موسوڵمانان ئەنجامی بدەن کیفایەتە و باقی موسوڵمانەکانی تر لەسەریان لا دەچێت، کەواتە ئەگەر کەسێک مرد، دەبێت هەندێک لە موسوڵمانان نوێژی لەسەر بکەن، ئەگەر نا گشتیان تاوانبار دەبن .

فەزڵ و گەورەیی نوێژی مردوو: پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (مَن صَلَّى على جنازةٍ فله قيراطٌ ، ومن انتظرها حتى توضعَ في اللحدِ فله قيراطان والقيراطان مثلُ الجبلينِ العظيمينِ) واتە: هەرکەسێک نوێژ لەسەر مردوویەک بکات، بە ئەندازەی چیایەکی گەورە پاداشتی بۆ هەیە، وە هەر کەسێک لەدوای نوێژ کردنەکە چاوەڕوانی بکات، هەتا دەشاردرێتەوە بە ئەندازەی ٢ چیای گەورە ئەجر و پاداشتی بۆ هەیە .

### چۆنیەتی نوێژی مردوو :

١. گشت نوێژێک لە نوێژەکان دەبێت بە دەست نوێژەوە بکرێت .

٢. ئەم نوێژە بە پێوە ئەنجام دەدرێت بەڵام ڕکوع و

سجود و دانیشتن و تەحیاتی تێدا نیە .

٣. پێک هاتووە لە چوار تەکبیر. لە دوای تەکبیری یەکەم سورەتی (فاتحە) دەخوێنرێت لەگەڵ سورەتێکی تر لە قورئان، وە لە دوای تەکبیری دووەم (صلاوات) لەسەر پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) دەدرێت، وە لە دوای تەکبیری سێیەم ئەم دوعایە بۆ مردووەکە دەکرێت: (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ وَارْحَمْهُ وَعَافِهِ وَاعْفُ عَنْهُ وَأَكْرِمْ نزلُهُ وَوَسِّعْ مُدْخَلَهُ وَاغْسِلْهُ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ وَنَقِّهِ مِنْ الْخَطَايَا كَمَا نَقَّيْتَ الثَّوْبَ الْأَبْيَضَ مِنْ الدَّنَسِ، وَأَبْدِلْهُ دَارًا خَيْرًا مِنْ دَارِهِ وَأَهْلًا خَيْرًا مِنْ أَهْلِهِ وَزَوْجًا خَيْرًا مِنْ زَوْجِهِ، وَأَدْخِلْهُ الْجَنَّةَ وَأَعِذْهُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ و مِنْ عَذَابِ النَّار) وە لە دوای تەکبیری چوارەم (دوعا) بۆ مردووەکە و بۆ خۆیی و گشت موسوڵمانان دەکات، وە دەشتوانێت یەکسەر سەلام بداتەوە، وە سەلام دانەوەی نوێژی مردوو وەکو سەلام دانەوەی باقی نوێژەکانی ترە، وە جائیزیشە تەنها یەک سەلام بەلای ڕاست بدرێتەوە. وە هەروەها جائیزە پێنج تەکبیر یان شەش تەکبیریان حەوت تەکبیر یان نۆ تەکبیر بۆ نوێژی مردوو بکرێت، گشتی بەڵگەی (صحیح)ی لەسەرە.

دەمەویت زۆر بە کورتی باسی تەعزێ بکەم لێرەدا،

چونکە بابەتێکی زۆر گرنگە ئێمە دەبیت بە وریاییەوە ئاگاداری ببین. گەر کەسێ بمرێ تەعزێی بۆ دانەنەن خەڵکی بە خاوەن مردووەکە دەلێت بۆ دایینانەن یان دەلێن کابرا ڕەزیلە تەعزێیان بۆ مردوەکەیان دانەنا. کە هیچ بەڵگە و حەدیسێکمان نیە لەسەر ئەوەی کە دانانی تەعزێ جایز بێت! یان باسی ئەوە بکات کە کەسیک دەمرێت دەبێت خوانی شاهانە دابنرێت و خەلکی تێر بکرێت. ئەمەش هەر ٤ مەزهەبەکە لەگەڵ ئەوەیان. لە کاتێکدا کە کەس و کاری مردووەکە کەسێکیان لێ نەماوە، سەرەڕای ئەو بارگرانیەی بەسەریان هاتووە بارگرانی مادیش بکەوێتە سەریان. ئەوەی کە لە سەر ئێمە لە ئیسلامدا فەرزکراوە کاتێک کەسێک دەمرێت دەبێت ئێمە

١. مردوەکە بشۆین.

٢. نوێژی لەسەر بکەین.

٣. بچین بۆ سەر قەبرسان.

ئەوەی لەم ڕۆژە دەکرێت کە تەعزێدانان جۆرێکە لە بیدعەکان کە بڵاوەبووەتەوە لە کۆمەڵگای ئێمە. بەو هیوایەی کە ئیتر پێش ئەوەی کارێک ئەنجام بدەین بیری لێ بکەینەوە ئایە خوداکەم ئەم کارەی منی بە دڵ دەبێت، یا لە ئاینەکەم بە دروست دانراوە؟

## دەستنوێژی شەرعی چۆنە؟

دوو جۆرە شێوازی دەستنوێژی شەرعیمان هەیە، پشت بەخودا ئێمە بەپێی توانامان لێرەدا باسی دەکەین. داوەکارم لە پەروەرێنم کە من و ئێوەش بە سەرکەوتن بگەیەنێت.

ئەم شێوازی دەستنوێژەیان کە باسی دەکەین واجبە بەبێ ئەو شێوازە دروست نییە و ئەمەیە کە لەم ئایەتەدا هاتووە، کە دەفەرمووێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُوا بِرُؤُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ) (المائدة ٦) واتە: (ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان بەخودای پەروەردگار و بە پەیامبەرەکەی هێناوە ئەگەر ویستان بۆ نوێژەکانتان هەستن، و دەستنوێژتان نەبوو ئەوا ڕوومەت و دەست و باسکەکانتان لەگەڵ ئانیشکەکاندا (کە بریتیە لەو جومگەیەی کە باسک بە باڵەوە دەبەستێت) بشۆن، و دەست بهێنن بە سەرتاندا و پێکانتانیش لەگەڵ قولەپێکانتان (کە بریتیە لەو دوو ئێسکە بەرزبووەی کە لە شوێنی یەکتر گرتنی پێیە بە لاقەکانەوە) بشۆن. کە بریتیە لە شۆردنی دەموچاو یەک جار کە

ئاوڕادانە ناو دەم و لووتی تێدایە، وە شۆردنی دەستەکان کەلەسەری پەنجەکانەوە دەست پێدەکات هەتا ئانیشک یەک جار، وە دەبێت ئەو کەسەی دەستنوێژ دەگرێت تێبینی شۆردنی ناولەپی بکات لەگەڵ قۆڵیدا، چونکە کەسانێک لەوە بێئاگان و تەنها قۆڵی دەشۆرێت و ئەوەش هەڵەیە، پاشان مەسحی سەری دەکات یەک جار و گوێیەکانیش لەگەڵ سەردان، وە لە کۆتاییدا شۆردنی پێیەکان لەگەڵ قاچەکانی ئەویش یەکجار، ئا ئەمە شێوازە واجبەکەیەتی کە دەبێت ئەنجام بدرێت)

شێوازی دووەم: لە چۆنێتی دەستنوێژ کە سونەتە ئەوەیە کە ئێستا پشت بە پەروەرگارم باسی دەکەین: سەرەتا (بسم الله) دەکات و سێ جار دەستی دەشۆرێت، و پاشان سێ جار ئاوڕادەداتە ناو دەم و لوتی بەسێ مشتی ئاو، پاشان سێ جار دەموچاوی دەشۆرێت، پاشان سێ جار دەستەکانی هەتا ئانیشکەکانی دەشۆرێت، کە بە ڕاست دەست پێ دەکات و دواتر دەستی چەپ، پاشان یەک جار مەسحی سەری دەکات، دەستەکانی تەڕ دەکات و دەیهێنێت بە پێشەوەی سەریدا هەتا پشتی سەری و دەیهێنێتەوە بۆ پێش سەری، پاشان مەسحی گوێی دەکات، کە پەنجەی شایەتومان دەخاتە نێو گوێی و بە پەنجە

گەورەشی پشتی گوێی مەسح دەکات و پاشان سێ جار پێیەکانیشی لەگەڵ قاچەکانی پێی دەشۆرێت کە بەپێی ڕاست دەست پێ دەکات و پاشان پێی چەپ پاشان لە کۆتاییدا دەڵێت: أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله، اللهم اجعلني من التوابين واجعلني من المتطهرين. وە هەر کەسێک ئەمە ئەنجام بدات ئەوا هەر هەشت دەرگاکەی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە، بەم شێوەیە بە صەحیحی هاتووە لە پێغەمبەری خوداوە (صلى الله عليه وسلم) وەکو (عومەر) رضي الله عنه دەیگێڕێتەوە.

لە کاتی دەستنوێژدا با ئەوە بزانین:

هەندێ لە خەڵکی بەتایبەت لە زستاندا لەکاتی شۆردنی دەستەکانیاندا بەشێوازێکی تەواو قۆڵیان هەڵناکەن ئەمەش سەردەکێشێت بۆ ئەوەی بەشێک لەباڵیان وازلێبهێنن بەبێ شۆردن، ئەمەش حەرامکراوە و دەست نوێژ گرتن لەگەڵ ئەم وازێنانە لەو بەشەی باڵ صەحیح نییە، بەڵکو پێویستە قۆڵی بە جوانی هەڵبکات تاوەکو پشتەوەی ئانیشکی و ئانیشکی بشوات لەگەڵ دەستیدا لەبەرئەوەی لە فەرزەکانی دەستنوێژە.

- هەڵەیەکیتر کە دەیکەین، ئەوەیە کە وادەزانینن لەکاتی دەستنوێژدا ئێمە پێویستمان بە خۆپاککردنەوە (تاراتە) کە

ئەمەش دوورە لە ڕاستیەوە کە ئێمەی موسڵمان لێی حاڵی بووین، ئەما لە حاڵەتێک کەسەکە پێویستیەتی، کە کەسەکە تەنگاو بێت ئەو کاتە دەبێت ئەنجامی بدات، هیچ بەڵگەیەکمان نیە کە پێش دەستنوێژ تارات بگرین، تەنها یەک بەڵگەمان هەیە ئەویش لە کتێبی (فوقها): (کە هەمیشە پێش  ئەوەی باسی دەستنوێژ بکرێت باسی خۆپاک کردنەوە دەکرێت) ئەمەش بەڵگە نیە ڕاستی، ئەویش مەبەستی ئەوەیە کە کەسێک دەستنوێژهەڵبگرێت پێویستە پاک بێت واتا تەنگاو نەبێت. وە ئەم کارە نە فەرزە نە واجبە. بەڵکو هەر کەسێک پێویستی بە تارات بوو دەبێت بیکات. (عوسمانی کوڕی عفان) بۆمان ڕیوایەت دەکات کە چۆن پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەستنوێژی گرتووە، وە هەروەها سەرجەمی ڕیوایەتەکانیش بەم شێوازەیە، کاتێک دەتەوێت دەستنوێژ بگریت، ئەگەر پێویستت بە مرافقە ئەوە بچۆ گەر پێویستت نیە مەچۆ.  بۆ نموونە تۆ بەیانی لە خەو هەڵدەستی پێویستت بە مورافق نیە کەوایە مەچۆ، چونکە زۆر کەس هەیە دەڵێت تاراتم نیە. زۆر کەس هەیە دەلێت پێویست دەکات پێش دەستنوێژ تاراتبگرم؟ ئەڵێین گەر موحتاجی برۆ گەر موحتاج نیت پێویست ناکات.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە دەستنوێژی گرتوە لە سەرەتا نەی

فەرمووە نیەتم وایە حوکمی بێ دەستنوێژی لەسەرم لادەم، تەنها (بسم الله)یکردووە تەنانەت (بسم الله الرحمن الرحيم)ی نەکردوە.

سوپاسی زانای پایەبەرز (محمد بن صالح العثيمين) لە کتێبی (فتاوی أركان الإسلام) یەرمەتیدەرمان بوو، لە تەواو کردنی ئەم بابەتەدا. خودای گەورە لە تاوانی خۆش بێت.

# چیرۆکی ٢ منداڵەکە

٢ منداڵ دەڕۆن بۆ مزگەوت لەوێ ویستیان بچن دەست نوێژ بگرن، کاتێک بینیان پیرەپیاوێک دەستنوێژ دەگرێت، بەڵام شێوازی دەستنوێژەکەی هەڵەیە، ٢ منداڵەکە بیریان کردەوە چۆن بەم پیرەپیاوە بڵێن کە شێوازی دەست نوێژەکەی هەڵەیە و تێیبگەیەنن! لە دوایی ئەوەی بیریان کردەوە، ٢ منداڵەکە چوون بۆ لای پیرەپیاوەکە وتیان: مامە ئێمە دەستنوێژ دەگرین، بزانە کامان شێوازی دەستنوێژەکەمان ڕاسترە، ٢ منداڵەکە دەستیان بە دەستنوێژ هەڵگرتن کرد، یەکیان لە منداڵەکە دەست نوێژەکەی بە شێوازێ دەست نوێژی پیرەپیاوەکە هەڵگرت، ئەوەی تریشیان بەشێوازێکی دروست کردی، کاتێک پیرەپیاوەکە هەستی بەوە کرد کە دەستنوێژی منداڵێکیان هەڵەیە و خۆشی وەک منداڵە وایە کە هەڵەی دەکرد، دوای ئەوەی تەواو بوون پیرەپیاوەکە درکی بە هەڵەی خۆی کرد و تێگەشت کە هەڵەکەی چیە و دەستی بە چاکردنی هەڵەکەی کرد. لەم چیرۆکەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئەم ٢ منداڵە بە ئاقڵانەوە بیریان کردەوە چی ڕێگایەک بەکاربهێنن، کە ئەم پیرەپیاوە درک

به هەڵەکەی بکات. وە ئەو کەسانەی کە بەساڵاچوون وا زیاتر هەست دەکەن کە خۆیان ڕاست دەکەن وا هەست دەکەن کە ئەوەی دەیکەن هەموو کارێکیان ڕاستە، بۆیە پێویستە بە شێوازێکی جوان لەگەلیان مامەڵە بکرێت. کەسانی بە ساڵاچوو دەبێت زۆر بە نەرموو نیانی مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت، دەبێت باشترین هەڵسوکەوتیان لەگەڵ ئەنجام بدرێت، زیاتر ئاگاداریان بین ئەو قسەیەی دەیکەین بەرامبەریان دەبێت بە بیرکردنەوە ئەنجامی بدەین، لەگەڵیان ئەوان کەمتر دەسەڵاتیات هەیە کەمتر توانا و هێزیان هەیە، یۆیە دەبێت ئێمە لەگەڵ هەر دەربڕینی هەر قسەیەکماندا بەتەواوی بیری لێبکەینەوە، پاشان بەرامبەریان بیکەین، چونکە تەمەنێکی هەستیاریان هەیە ئەوان تەمەنیان وەک تەمەنی منداڵی لێدێت. بۆیە ئێمە دەبێت دەرز لەم چیرۆکەی ٢ منداڵە وەربگرین کە بەم شێوازە جوانە توانیان هەڵەی ئەم پیرەپیاوە ڕاستبکەنەوە.

# منداڵ

منداڵ دونیایەکی پاک و بێگەرد و جوانە، پڕیەتی لە خەونی ڕەنگاوڕەنگ، وەکو دونیای گەورەکان وشک و برینگ و ڕەق وتەق نییە، دنیایەکی ئەرخەوانی و ڕەنگەڵایی نایاب و پڕتام و چێژە، دەبێ ئەوانەی بە ئەرکی پەروەردەیی هەڵدەستن کەسانی شارەزاو پسپۆڕبن. پەیوەندی منداڵ لە ڕێگەیەی ئەو خەندە پاکەوەیە کە بەردەوام دەیخاتە سەر دەمی زۆربەی کاتیش لە ڕێگەی گریانەوە یاخود درکاندنی چەند وشەیەکی کەم دەتوانێت پەیوەندی لەگەڵ دایکی یان دەوروبەریدا بکات. منداڵ کائینێکی بێتاوانە، ڕۆڵ و گرنگی دایک لە پەرەوەدەیەکی دروست و ئاراستەکردن بەرەو ڕێگایەکی دروست، بە پلەی یەکەم دێت، دایک دەتوانێت منداڵێک پەروەردە بکات. دەوروبەریش ڕۆڵێکی کاریگەریان هەیە، هەندێ جار کاریگەری ئیجابی و هەندێ جاریش بە پێچەوانە ڕۆلێکی باش ناگێڕن لە ئارەستە کردنی منداڵدا. چیرۆک بیروخەیاڵی منداڵ فراوان دەکات، وای لێدەکات دونیا بە جۆرێکی جوانتر ببینێت، ئەرکە لەسەرمان چیرۆک بۆ منداڵەکانمان باس بکەین بەتایبەت

ئەو چیرۆکانەی کە لە قورئانی پیرۆزدا باسکراون. کەسێتی و بەرهەمی منداڵ وەکو مۆم وایە چۆن هەوڵی بۆ بدەی و بیپارێزی بەو شێوازەش دەردەکەوێت. بە داخەوە دیارە زۆربەی دایک و باوکان کە باس لە پەروەردەی مناڵ دەکەن، وا بیر دەکەنەوە مناڵ پێداویستییەکانی سەرەتایی وەکو جلووبەرگ، خواردەمەنی و پێدانی بڕێک پارە و هەندێ جاریش دڵسۆزی و دڵۆڤانی هەبێ ئەوە باشترین پەروەردەی بۆ دەستەبەر کراوە و چاوەڕوانی داهاتوویەکی گونجاویشی بۆ دەکەن! کە ئەمەش هەرگیز تەواو نیە، بۆ ئەوەی منداڵێکی صاڵح پەروەردە بکەین، دەبێت ئێمە مێشکی منداڵەکانمان بەرەو گەشەسەندنێکی باش و بیرێکی فراوان بەرین، لەوتەمەنەیاندا هەوڵی شارەزای دینیان بکەین، ئیمامی شاقعی لە تەمەنی ٧ساڵیدا تەواوی قورئانی پیرۆزی لەبەر بووە، لە تەمەنی ١٥ ساڵیدا تەواوی فەرموودەکانی پێغەمبەری خودای لەبەر بووە. دایک و باوکان زۆر دوعا لە منداڵەکانیان دەکەن، دوعایی دایک و باوک زۆر کاریگەرە بۆ منداڵ، لە هەمانکاتدا لە شەرعی خودای گەورەدا دەبێت دایک و باوک ئامۆژگاری منداڵەکانیان بکەن، لەمبارەیەوە خودای گەورە باسی

عەبدێکی ساڵحی خۆیمان بۆ دەکات لە قورئانی پیرۆزدا کە چۆن ئامۆژگاری منداڵەکەی دەکات. (وَإِذْ قَالَ لُقْمَانُ لِابْنِهِ وَهُوَ يَعِظُهُ يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ) (لوقمان ١٣) واتە: (جا لوقمان بە کوڕەکەی خۆی وت: لە کاتێکدا کە ئامۆژگاری دەکرد، کوڕە شیرینەکەم نەکەیت شتێک یان کەسێک بە هاوتا و هاوبەشی خودا بڕیار بدەیت، چونکە بەڕاستی هاوتا و هاوبەشی بڕیاردان ستەمێکی زۆر گەورە و ناڕەوایە).

لە جیاتی دووعای خراپ دووعای باشەی بۆ بکە، یاخود شتێک دەشکێنێت هەزاران قسەی ناشرینی پێدەڵێیت. تۆ خاوەنی منداڵێکی یان چەن منداڵێکی کە خودا پێتی بەخشیوی قەدری بزانە، چونکە ئەو منالەی تۆ قسەی پێ دەڵێت ئاواتی هەزاران خێزانە، کە ئەوەی هەیانە دەیبەخشن، تەنها لە پێناوی بە دەستهێنانی منداڵێک، بۆیە خۆت لە شوێنی ئەوان دانێ ئایە چیت دەکرد، گەر بەو شێوەیە بوویتایە، هەردەم شوکری خودا بکە، بەو هەموو نیعمەتانەی کە خودا پێی بەخشیوی. دڵنیابە بوونی منداڵێکی صالح هەموو خۆشیەکی دونیا دەهێنێت، چونکە لەگەڵ هەر کارێکی باش کە دەیکات، پاداشت بۆ دایک و باوکی دەنوسرێت. لەمبارەیەوە خودای گەورە لە قورئانی

پیرۆزدا باسی پیاوچاکێکمان بۆ دەکات، کە لەگەڵ پێغەمبەر موسادا لە گەشتێکدا بووە، کە منداڵێکی کوشتووە. (فَانطَلَقَا حَتَّى إِذَا لَقِيَا غُلَامًا فَقَتَلَهُ قَالَ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةً بِغَيْرِ نَفْسٍ لَّقَدْ جِئْتَ شَيْئًا نُّكْرًا) (الكهف ٧٤) واتە: (دوایی دابەزینە سەر وشکانی) کەوتنەڕێ، هەتا گەیشتنە منداڵێک، زاناکە گرتی و کوشتی، موسا وتی: سەیرە! ئەوە بۆچی کەسێکی بێ گوناهت کوشت! بێ ئەوەی ئەو تاوانێکی وای کردبێت و (شایستەی کوشتن بێت) سوێند بەخودا بەڕاستی کارێکی ناپەسەندو ناڕەوات ئەنجامدا) (وَأَمَّا الْغُلَامُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ فَخَشِينَا أَن يُرْهِقَهُمَا طُغْيَانًا وَكُفْرًا) (الكهف ٨٠) واتە: (منداڵەکەش (کە کوشتم) دایک و باوکێکی ئیمانداری هەبوو، ترساین لەوەی کە بەسەرکەشی و بێ دینی و خوانەناسی هیلاک و ماندویان بکات (چونکە هەر لە ئێستاوە سەرکەشی و لاساریی پێوە دیار بوو) ئەوەی پێویستە بیزانیت شێوازی پەروەردەکردنیەتی، بزانیت چۆنایی و بەچی ڕێگایەک منداڵەکەت پێدەگەیەنیت، هەر لە سەرەتای تەمەنیەوە فێری دینداری بکەیت. منداڵ بەخێوکردن هەرگیز ئاسان نیە، چونکە دەبێت بزانیت کامە ڕێگا دەگرینە بەر بۆ پەروەردەکرتنی منداڵەکانمان. سیگمۆند فرۆید دەڵێ: (لە

تایبەتمەندییە گرنگەکانی منداڵ لە تەمەنی تازە لە دایکبوو بۆ٢ ساڵ لە ڕووی دەروونییەوە ساز نییە و ئەوانی دی دەبێت ئاگاداری بن. (خێزان بە یەکەمین قوتابخانەی منداڵ دادەنرێت، گرنگیدان بەشێوەی پەروەردە و ئاستی ڕۆشنبیری دایک و باوک، ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێ لە ئاست و دەوڵەمەندی زمانی منداڵەکە. پێویستە دایکان و باوکان هەمیشە بە ئاگاییەوە بتوانن پەروەردەیەکی دروستی منداڵەکانینان بکەن، بەبێ جیاوازی و ڕەچاوکردنی ڕەگەزی. هەمیشە لە سەر یەکسانی و هاوسەنگی لە ماڵ و کۆمەڵگادا ڕایان بهێنن، هەمیشە یەکێک لەو کارە قورس و گرانەی کە دەکەوێتە ئەستۆی دایک و باوک، پەروەردەکردنی منداڵەکەیانە، چونکە ئەرکێکە پێویستی بە زانیاری و لێهاتووی هەیە بە پێچەوانەوە کاردانەوەی نێگەتیڤی دەبێت لەسەر منداڵ بۆیە پێویستە ڕەچاوی چەند بنەمایەکی سەرەکی بکرێت لەپەروەردەکردنی منداڵدا. بنەماکانیش بریتین لە (ڕێزگرتن، لێبووردەیی، بەرپرسیاریەتی، هاوڕێیەتی، ڕاستگۆیی و گوڕایەڵی) چونکە منداڵ لەسەرەتاکانی قۆناغەکانی ژیانیدا پێویستە زۆر بە وریایەوە و بەرپرسیارانە بزانرێت چۆن پەروەردە دەکرێت . یەکێک لە بنەما گرنگەکانی پەروەردە ئەوەیە

پێویسته منداڵ گوێی بۆ بگریت و بۆ ئەوەی بتوانێ خواست و داواکاریەکانی خۆی بگەیەنیت و منداڵێکی زمان پاراو و گوێڕایەڵی لێبنیات بنرێت، بۆ ئەوەی لە داهاتوودا ئەویش ئەو پەروەردەیەی وەرگرتبێت کە گوێڕایەڵی دایک و باوکی بێت. بەتایبەتی لەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆ کە تێیدا دەژین، بەکارهێنانی سۆشیال میدیا زۆر بەرفراوانبووە و ڕێژەیەکی زۆری بەرنامە و پرۆگرامی جیاواز هەیە کە منداڵان وا بەستەی بوون، کە لە ڕێژەیەکی زۆر مەترسیدار دایە، و بەشێکی زۆری منداڵان فێری توندوتیژی دەبن و منداڵی شەرانگێزیان لێ بەرهەم دێت. ڤیگۆتسکی، دەروونناسی ڕووسی لە لێکۆڵینەوەکانی خۆیدا، لای وایە کە یاری و یاریکردن، کاریگەری لەسەرپەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان هەیە و لای وایە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، سەرەتا لە یاری کردندا گەشە دەکەن و پەرەدەستێنن، بەو واتایە کە منداڵەکان چاو لە کرداری دایک و باوکیان دەکەن، گوێ لە قسەکانیان دەگرن و دواتر لە کاتی یاری کردندا، هەوڵ دەدەن ئەنجامیان بدەنەوە. لەو کاتەشدا باشتر وایە دایک و باوکەکان، هاریکاریی منداڵەکانیان بکەن، ڕێنماییان بکەن و هەڵەکانیان چاک بکەن و لە کاتە هەستیارەکاندا،

بەهانایانەوە بچن. منداڵ تەنیا لە ڕێگەی گوێگرتنەوە فێری دەیان و سەدان وشە دەبێت. دایک و باوک ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێ لە ئاست و دەوڵەمەندی زمانی منداڵەکە. ئامادەیی دایک و باوک بۆ ڕەخساندنی پێداویستییەکانی گەشەی زمان، هەنگاوی یەکەمە بۆ فێربوونی زمانێکی دەوڵەمەند کە بنەمای دروستبوونی کەسایەتییەکی بەهێزی ئەو منداڵەیە. پێویستە ئەو وشانەی دەدرکێن زۆر بە وریاییەوە بدرکێن لەلایەن دایک باوکەوە، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا بنەمایەکی بەهێز و پەروردەیەکی دروستە. گەر ئێمە بڕیاری دروست کردنی منداڵ بدەین دەبێت بزانین چۆنایش پەروەردەی دەکەین. بەوهیوایەم پێش ئەوەی هەوڵی منداڵ دروستکردن بدەین، بیر لە چۆنێتیێ گەورەکردنی بکەینەوە.

# دایک و باوک

دایک و باوک ئەو کەسە پیرۆزەن کە دەبنە مایەی هێنانە بونی وەچە بۆ سەر ژیان، کەواتە شایستەی ئەوەن ئەوپەڕی ڕێز و باڵی ملکەچیان بۆ ڕابخرێ.

خودای گەورە دەفەرموێت: (وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيمًا*وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا) (الإسراء ٢٣-٢٤)

واتە: (پەروەردگارت فەرمانی داوە لەو زیاتر کەسی تر نەپەرستن و لەگەڵ دایک و باوک بە باشی ڕەفتار بکەن. گەر یەکێکیان لە لات پیر بوون پێیان مەڵێ ئۆف لەبەر بێزاری، گەر داوای شتێکیان لێ کردی. گەر شتێکت بە دڵ نەبوو سەرکۆنە و سەرزەنشتیان مەکە. قسەی خۆش و نەرم و نیانیان لەگەڵ بکە و باڵی ملکەچی بەزەیی‌یان بۆ ڕابخە. بڵێ خودایە ڕەحم بە دایک و باوکم بکە، وەک ئەوان منیان بە بچوکی بەخێو کردوە و پێگەیاندوە.)

پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: (ألا أنبئكم بأكبر الكبائر؟ الشرك بالله، وعقوق الوالدين) (رواه البخاري)

واتە: (ئایا هەواڵی گوناهە هەرە گەورەکانتان پێ ڕابگەیەنم؟ بریتین لە هاوبەش دانان بۆ خودا و ئازاردانی دڵی دایک و باوک)

هەروەها پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (رغم انف من أدرك والديه عند الكبر أو أحدهما ولم يدخل الجنة). (رواه مسلم والترمذي) واتە: (لوتی ئەو کەسە بەقوڕدا چێ، کە دەگات بە دایک و باوکی، یان یەکێکیان لەکاتی پیری و خزمەتێکی وایان ناکات کە پێی بچێتە بە هەشت) کاتێک دایک و باوکمان دەچنە تەمەنەوە ئێمە دەبێت زیاتر لە جاران ئاگامان لیانبێت زیاتر چاوپۆشی لە هەلەکانیان بکەین. هەروەها دەفەرموێ: (أنت ومالك لوالدك! إن أولادكم من أطيب كسبكم، فكلوا من كسب أولادكم) (رواه أحمد في المسند وأبوداود) واتە: (تۆ و ماڵ و سامانت هی باوکتە! منداڵەکانتان لە باشترین دەستکەوتی ئێوەن، دە کەواتە لە دەستکەوتی منداڵەکانتان بخۆن)

جارێکی تر پەیامبەر دەفەرمووێ: (إن الله حرم عليكم عقوق الأمهات) (رواه البخاري) واتە: (خودای گەورە ئازار دانی دڵی دایکانی لە سەرتان حەرام کردوە).

هەمیشە خزمەتیان بکە گریمان دایک و باوکت خراپبن لەگەڵت، با خراپەیان بۆت هەبوو بێت، بەڵام تۆ هەر

دەبێت باش بیت بۆیان. مامۆستایە خۆشەویستم ئەمەی بۆم دەگێڕایەوە دەیوت: کابرایەک لەو وڵاتە ئەوروپیانە دەیوت: لە گەڕەکەکەمان بۆنێکی ناخۆش دەهات هەرنەمان دەزانی چیە! ڕۆژانە ئەم بۆنە زیادی دەکرد، تا ڕۆژێک بە پۆلیسمان وتوو هاتن، کاتێک بینیمان کابرایەکی پیر کە دراوسێمان بوو، لەناو باخچەکەیاندا مردووە و بۆنی دەرچووە، دوای مانگێک کابرایەک دەدات لە دەرگای ئەو ماڵەی کە پیاوەکە مردووە، بە سەگێکەوە هاتووە هەردەدا لە دەرگا کابرای دراوسێیان دەڕوا دەڵێت فەرموو: تۆ کێیت؟ دەڵێت: من کوری ئەم پیاوەم باوکم لەمال نیە؟ کابراش دەڵێت: ڕۆڵە باوکت مردووە تۆ تازەدێیت بۆلای، دەڵێت: کورەکە بەلایەوە شتێکی موعجیب نەبوو بەس وتی ئۆو مایی گاد ئای خودایە!!! لێدا ڕۆشت. ئەم باوکە چەنێک ئەم کوڕەی گەورە کردووە گەیاندویەتی بەم ڕۆژە ئەو هەموو ئازار و ناخۆشی و مەینەتیەی بەسەری هاتووە کەچی ئەمیش بەم شێوە ڕەفتاری لەگەڵ دەکات و بەخەیاڵیا ناهات هیچ سەردانیەکی نەدەکرد تەنها وەک بلێین کەسێکی بێگانەی لەوێدایە نەوەک ماڵی باوکی. دایک و باوک هیلاکەت و ڕەنجەشان و ماندوبوونی زۆریان چەشتووە، هاتا وەکو

ئێمەیان گەیاندووەتە ئێستا و ئێمەیان پێ گەیاندووە، هیلاکیان چەشتووە، نەهامەتیان چەشتووە، هەژاریان چەشتووە، هەزاران شەو هەبووە نەخۆش بوویتە لات خەوتوون. خودای گەورە دەفەرموێت: (وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ إِحْسَانًا حَمَلَتْهُ أُمُّهُ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلَاثُونَ شَهْرًا) (الأحقاف:١٥ ) واتە: (فەرمانمان بە ئادەمیزاد کردووە چاکە لەگەڵ دایک و باوکیا بکات، چونکە دایکی بە ئێش و ئازار و ناخۆشی‌یەوە ٩ مانگ لە سکیدا هەڵیگرتووە، کاتێکیش لەدایک بووە، بە هەمان شێوە ئێش و ئازار و ئەشکەنجەی بینیوە. جا بە حەمل و لەشیر بڕینەوەکە دەگاتە ٣٠ مانگ، دایکەکە لەم ئازارە دایە) {هەرگیز ئەو ڕۆژانەم بیرناچێت کە بۆ ئیشکردن لە شارێک بووم، چەند ڕۆژێکی زۆرم پێ دەچوو، دایکم جاری وا هەبوو ئەوەندە دڵی لام دەبوو، کە خەوی لێنەدەکەوت، ئەوەندە فکر و هۆشی لای من بووە، کە تەندروستیی خۆی لەبیر دەکرد و بیری لە من دەکردەوە کە دەهاتمەوە دەیبینی پێیەکانم بەهۆی زۆر بە پێوە وەستان بووبوون بە برین، هەرگیز خۆی پێنەدەگیرا و دەگریا، ڕۆژانە چەندین تەلەفونیان دەکرد چی دەکەیت؟ لەگەڵ کێیای؟ خەریکی چیت؟ نانت خواردووە؟ هیچت

ناوێت؟ لەکوێ دەمێنیتەوە؟. هەتاکو دایکت ماوە قەدری بزانە، چونکە کە ڕۆشت گەڕانەوەی نییە هەرگیز تام و لەزەتی ئەو دایکە بە کەسانی تر پڕ نابێتەوە}

خودای باڵا دەفەرموێت: (وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَائِيلَ لاَ تَعْبُدُونَ إِلاَّ اللّهَ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً ) (البقرة:٨٣) واتە: (کاتێک پەیمانی متمانەییمان لە بەنی ئیسرائیل وەرگرت، کە جگە لە خودا کەسی تر نەپەرستن و بەندایەتی بۆ نەکەن و لەگەڵ دایک و باوکانیش باش بن)

وە دەفەرموێت: (وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًا عَلَى وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ) (لقمان: ١٤) واتە: (فەرمانمان بە ئادەمیزاد کردووە، لەگەڵ باوک و دایکی باش بێ و چاکەیان لەگەڵدا بکات، چونکە دایک بە هۆی سک پڕبییەوە توشی بێ هێزی و سستی لەش و (مضاعفات) دەبێت. ئەم دایکە بۆ ماوەی ٢ ساڵ شیری دەداتێ. لەبەر ئەوە سوپاسی من بکە و سوپاسی دایک و باوکت بکە، چارەنوسیشتان گەڕانەوەیە بۆ لای من)

(مردن کات و سات نازانێت، دڵنیابە نەخواردنی چایەکی دایکت ئەگەری ئەوەی هەیە تا مردن لێی پەشیمان بیت)

(ئەو خواردنەی کە دایکت بۆتی ئامادە دەکات، هەرگیز لە هی هیچ کەسێک نایدۆزیتەوە)

هەرگیز ئێمە ناتوانین قەرزی دایک و باوکمان بدەینەوە بۆ ئەو چاکانەی بەرامبەرمانیان کردوویانە. دەبێت بتوانین ئەوەی باشە بەرامبەریان بیکەین، جوان ترین قسە بەرامبەریان بکەین، هەر بۆیە خودا واجبی کردووە لە سەرمان کە خزمەنی دایک و باوکمان بکەین تا دەمرن. پێش هەموو کەس ڕێز لە دایک و باوک، چونکە ئەوان لە هاوسەر و ماڵ و منداڵت نزیکترە لێت، دایک و باوک یەکەم کەسە کە پێویستە ڕێزیان لێبگریت بە تایبەت دایک، چونکە دایک زیاتر ئازاری کێشاوە، زیاتر ماندوو بووە، خەڵکی دەوروبەر لە گەورەییەوە دێنن بۆلات بەڵام دایک و باوکت لە منداڵیەوە لەگەڵتن و پێتەوە ماندوو بوونە، ئەم جۆرە کەسانەی کە دایک و باوکی خۆیان جێهێشتووە ئەگەر هەموو دونیا ببەخشێت لە پێناو خوداکەیدا لەو باوەڕەدام خودا هەر لێی خۆش نابێت، الله اعلم. بۆیە هەتا ماون ببە بە خزمەتکاریان ئەوەی لە تواناتدایە بۆیان بکە، دڵنیابە خودا یەک بە یەکی کارەکانت دەبینێت و پاداشت و چاکەت بۆ دەنوسێت.

(جاء رجل الى النبي صلى الله عليه وسلم يسأله: يا رسول الله من أحق الناس بحسن صحابتي؟ قال أمک! قال: ثم من؟ قال: أمک. قال: ثم من؟ قال: أمک. قال: ثم من؟ قال:

أبوك). (رواه البخاري و مسلم) واته: (پیاوێک هاته خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و لێی پرسی: ئەی پێغەمبەری خودا! کێ لە هەموو خەڵک شایستە ترە بیکەمە هاوەڵم و چاکەی لەگەڵدا بکەم؟

فەرموویی: دایکت.

گوتی: پاشان کێی تر؟

فەرموویی: دایکت.

گوتی: پاشان کێی تر؟

فەرموویی: دایکت.

گوتی: پاشان کێی تر؟

فەرمویی: باوکت.

# دایکی ئیمانداران خاتوو خەدیجە

خێزانی یەکەمی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ناوی خاتوو: (خەدیجە)یە، دایکیشی ناوی (فاطیمە)یە. خاتوو خەدیجە یەکێک بووە لەو ئافرەتانەی کە لەناو قوڕەیشدا بە ڕەوشتبەرزیی، ژیریی، قسەزانی، دەوڵەمەندی، ناسراو بووە، لەبەر داوێنپاکی و ڕەوشتبەرزی نازناوی (الطاهرة)ی لێ نرابوو. بەر لەوەی ببێتە خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) خاتوو خەدیجە دوو شووی تری کردووە. سەرەڕای ئەوەی کە بێوەژنیش بووە و تەمەنیشی هەبووە، بەڵام لەبەر ڕەوشتبەرزی چەندین کەسی ناودار و خاوەن هۆز و سامان و دەسەڵات داوایان کردووە، بەڵام ئەو شووی بە کەسیان نەکردووە. لە تەمەنی ٤٠ ساڵیدا و لەبەر سەر ڕاستی و دەست پاکی و ڕەوشتبەرزی پێغەمبەر (ﷺ)، خاتوو خەدیجە هاوەڵێکی خۆی بە ناوی(نفیسە) دەنێرێتە لای پێغەمبەر (ﷺ) و پێی ڕادەگەیەنێت کە ئەو ئامادەیە شووی پێ بکات، ئەگەر پێغەمبەری (ﷺ) بیەوێت. پێغەمبەری خودایش (ﷺ) داواکەی خاتوو خەدیجە ڕەت ناکاتەوە و لە تەمەنی ٢٥ ساڵیدا هاوسەرگیری لەگەڵ دەکات. پێغەمبەری خودا

(ﷺ)بەر لە خاتوو خەدیجە هیچ خێزانی تری نەبووە. ماوەی نزیکەی ٢٥ ساڵ ژیانی هاوسەرییان بەردەوام بووە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) لەو ماوەیەدا هیچ ژنی تری بەسەر خاتوو خەدیجە نەهێناوە. پاش ئەوەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) نیگای لە ئاسمانەوە بۆ دێت و دەبێت بە پێغەمبەر (ﷺ). خاتوو خەدیجە یەکەم کەس بووە کە باوەڕی بە پەیام و پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (ﷺ) هێناوە. لە ماوەی ژیانی هاوسەرییاندا خودای گەورە ٣ کوڕ و ٤ کچی پێ بەخشیون، کوڕەکان بە ناوەکانی (قاسم) کە یەکەم منداڵیان بووە و پێغەمبەری خودا (ﷺ) بە نازناوی ئەوەوە بانگ کراوە بە (أبو القاسم) پاشان: (عبدالله) (طیب یان طاهر). کچەکانیش بە ناوەکانی: (زینب)، (رقیە)، (أم کلثوم) و (فاطمە).

خاتوو خەدیجە هەر لە مەککە ٣ ساڵ بەر لەوەی پێغەمبەر (ﷺ) کۆچ بکات بۆ مەدینە لە مانگی ڕەمەزاندا و لە تەمەنی ٦٥ ساڵییدا کۆچی دوایی کردووە، تەرمی پیرۆزی لە (الحجون) بە خاک سپێردراوە. ئەوکات پێغەمبەری خودا (ﷺ) ٥٠ ساڵان بووە. خاتوو خەدیجە یەکێک بووە لەو خێزانانەی کە ڕۆڵێکی زۆر گرنگ و بەرچاوی بینیوە لە سەرخستن و پشتگیریکردن لە

پێغەمبەری خودا (ﷺ) و بانگەوازەکەی، بەتایبەتی لە سەرەتاکانی بانگەوازدا. هەر بۆیە کە خودای پەروەردگار هەر لە ژیانیدا مژدەی بەهەشتی پێ داوە. ئەبوهورەیرە بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: (أَتَى جِبْرِيلُ النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) هَذِهِ خَدِيجَةُ قَدْ أَتَتْ مَعَهَا إِنَاء فِيهِ طَعَامٌ وَشَرَابٌ، فَإِذَا هِيَ أَتَتْك فَاقْرَأْ عَلَيْهَا السَّلَامَ مِنْ رَبِّهَا، وَبَشِّرْهَا بِبَيْتٍ فِي الْجَنَّةِ مِنْ قَصَبٍ لَا صَخَبَ فِيهِ وَلَا نَصَبَ) واتە: (جبریل هاتە خزمەتی پێغەمبەری خودا (ﷺ) و پێی فەرموو ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەوە خەدیجەیە هات، خوانێکی پێیە خواردن و خواردنەوەی تێدایە، ئەگەر گەیشتە لات، پێی ڕابگەیەنە کە خودای پەروەردگار سەلامی لێ دەکات، مژدەیشی بدەرێ بە کۆشکێک لە ئەڵماس و مرواری لە بەهەشتدا کە نە ناخۆشی و نە نەخۆشی تێدا نابینێت) پێغەمبەری خودا (ﷺ) زۆر خۆشی ویستوە و تەنانەت دوای وەفاتیشی هەر باسی چاکە و یادەوەرییەکانی کردووە و هەمیشە کەس و کار و دۆستان و خزمەکانی لە بۆنەکاندا بەسەر کردوونەتەوە و بە باشترین ئافرەتانی سەر زەوی ناوی بردووە و فەرموویەتی: (خَيْرُ نِسَائِهَا مَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ، وَخَيْرُ نِسَائِهَا خَدِيجَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ) واتە: (باشترینی

ئافرەتانی ئەم سەرزەوییە، خاتوو مەریەمی کچی عیمران و خاتوو خەدیجەی کچی خوەیلدە) تەنانەت پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) ئەوەندەی باس دەکرد و وەسفی دەکرد، تا ئەو ئاستەی کە خاتوو عائیشە دەفەرمووێت: (مَا غِرْتُ عَلَى امْرَأَةٍ مَا غِرْتُ عَلَى خَدِيجَةَ وَلَقَدْ هَلَكَتْ قَبْلَ أَنْ يَتَزَوَّجَنِي بِثَلَاثِ سِنِينَ لِمَا كُنْتُ أَسْمَعُهُ يَذْكُرُهَا) واتە: (هەرچەندە خاتوو خەدیجە سێ ساڵ بەر لەوەی من ببمە خێزانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کۆچی دوایی کردبوو لە ژیاندا نەمابوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) ئەوەندە باسی دەکرد و یادی دەکرد، ئەوەندەی لەو غیرەم دەکرد لە هیچ خێزانێکی تری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەوەندە غیرەم نەدەکرد) سەرچاوە: کتێبی (ڕەواندنەوەی گومانەکان)

## بەسەرهاتی پیاوی دوو کچەکە

ئەم چیرۆکە بەو مانایەیە کە هەر کارێک کە خودا ئەنجامی دەدات، لەوەیە بۆ تۆ باش نەبێت بەڵام بۆ کەسێکی تر باشتر بێت، بۆیە هەرگیز مەلێ خودایە بۆ.!

پیاوێک دوو کچی هەبوو هەردووکیانی بەیەکساڵ دا بە شوو. یەکێکیان هاوسەرەکەی جوتیار بوو، ئەوەی دیکەشیان هاوسەرەکەی گۆزە و شتی دروست دەکرد. دوای ساڵێک باوکەکە بڕیاریدا سەردانی کچەکانی بکا، جاری یەکەم ڕووی لەو کچەی کرد کە هاوسەرەکەی جووتیار بوو، کچەکەی زۆر بەخۆشحاڵی پێشوازی لە باوکی کرد و زۆر ڕێزی لێنا.

باوکەکە گووتی: کچم ئەحواڵتان چۆنە ؟ کچەکە گووتی: باوکە زۆرباشین پیاوەکەم زەوییەکی بە کرێ گرتووە و بۆ کڕینی دانەوێڵە هەندێک پارەی قەرز کردووە و ئێستا چاندوویەتی، ئەگەر باران بباریێت ئەوا ئێمە باشترین قازانجمان دەبێت، ئەگەر بارانیش نەباریێت، ئەوا تووشی نەهامەتیەکی زۆر دەبین و زەرەرێکی زۆر دەکەین. پیاوەکە کچی یەکەمی جێهێشت و بەرەو لای کچی دووەمی بەڕێ کەوت.

کچی دووەم کە هاوسەرەکەی کاری دروست کردنی گۆزەی دەکرد زۆر بەڕێکی پێشوازی لە باوکی کرد، بە هەمان شێوەی خوشکەکەی ڕێزێکی زۆری لە باوکی گرت و شاگەشکەی گرت بە بینینی باوکی، دوای پشوودان باوکەکە لە کچەکەی پرسی: ئەحواڵتان چۆنە کچەکەم؟

کچەکە گووتی: پیاوەکەم خۆڵێکی زۆری بە قەرز کڕیوە، بۆ ئەوەی بیکاتە گۆزەی جۆراوجۆر، ئێستا گۆزەکانی دروست کردووە و خستویەتیە بەر هەتاو بۆ ئەوەی ووشک ببێتەوە، ئەگەر باران نەبارێت ئەوا گۆزەکانمان زۆر باش دەبێت. بەڵام ئەگەر باران ببارێت ئەوا تووشی زەرەرێکی زۆر دەبین و دەکەوینە ژێر قەرز و هەموو گۆزەکان لەناو دەچن.

کاتێک پیاوەکە گەڕایەوە ماڵەوە، خێزانەکەی لێی پرسی، کچەکانمان چۆن بوون؟

ئەویش گووتی: ئەگەر باران باری، ئەوا سوپاسی خودا بکە ، ئەگەر بارانیش نەباری، هەر سوپاسی خودا بکە. (وَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ) (البقره ٢١٦ ) واتە: (ڕەنگە ئێوە شتانێکتان پێ ناخۆش بێت بەڵام بۆ ئێوە واچاکترە) ژیان بەو جۆرەیە لەوانەیە ئەوەی بۆ تۆ قازانج بێت بۆ کەسانی دیکە زەرەر بێت، بە پێچەوانەوەش،

لەوانەیە ئەوەی تۆ بە چاوی زەرەر سەیری دەکەی، قازانجی بۆ خەڵکانێکی دیکە هەبێت. لەبەر ئەمە هەموو کات بڵێ سوپاس بۆ تۆ خودایە. چونکە تۆ بەو بچوکیەتەوە خوداش بەو گەورەیە خۆی دەزانێت چی دەکات کە بۆ بەندەکانی باشە. هەمیشە کارێک بکە کە هەرگیز زەرەرت پێنەگەیەنێت، بگرە دەبیتە خۆشبەخترین کەس لە دونیا تەنها شوکربە بەو بەشەی کە خودا بۆتی داناوە شوکر بە بەوەی کە خودا بۆت دەنێرێت. شوکر بە بەوەی کە خودا پێت دەبەخشێت چونکە ئەوەی خودا پێت دەبەخشێت باشترین هەڵبژاردەیە بۆت.

# پێغەمبەر ئەیوب

ئەو پێغەمبەرەی کە چەندین نەهامەتی بەسەرهات تا دوعای نەکرد خودا شیفای نەدا.

(پێغەمبەر ئەیوب) علیە سلام حەوت کوری هەبوو حەوت کچیشی هەبوو، سامان و مەڕ و ماڵاتێکی زۆری هەبوو، زۆر دەوڵەمەند بوو، ٧٠ ساڵیش لەسەر ئەم ژیانە بوو، دوای ئەوە لە کتوپڕ خودای گەورە هەموو مناڵەکانی لێ سەندەوە، دوای ئەوە گشت سەروەت و سامانەکەی لێ سەندەوە، دوای ئەوەش توشی نەخۆشیەک بوو کە چارەسەری نەبوو، ئەو نەخۆشیەی توشی هات بە جۆرێک قورس و بە ئازار بوو کە گۆشتی جەستەی لێ ئەبووەوە و هەڵدەوەری، دواتر بۆگەنی کرد، بە جۆرێک خەڵکی بێ چارەبوون دووریان خستەوە لە خۆیان، هەرچەندە پێغەمبەری خوداش بوو. خێزانەکەی (پێغەمبەر ئەیوب) ئەچوو ئیشی ئەکرد، هەتا خزمەتی (پێغەمبەر ئەیوب) بکات، تا وای لێهات ئیشیان پێ نەئەکرد و ئەویشیان دوور خستەوە لە خۆیان، چونکە ئەیان وتت: تۆ ئێمەش توشی نەخۆشی ئەکەیت. چونکە سەردانی (پێغەمبەر ئەیوب)ی ئەکرد. (پێغەمبەر ئەیوب) وای لێهات کرم لە سەر گیانی ئەکەوتە خوارەوە، ئەویش هەڵی ئەگرتەوە و کرمەکەی ئەخستەوە لەشی خۆی. ئینجا

تاقیکردنەوەکە گرانتر بوو، بۆ ئەوەی کە تەنها دڵی لێی ئەدا و تەنها زمانی ئەجوڵا، ١٨ ساڵ بەو نارەحەتیە مایەوە بۆ یەکجار لە ڕووی نەهات بڵێ: خودایە شیفام بدە، هەتا خێزانەکەی پێی وتت: تۆ یەک جار داوا لە خودا بکە، من دڵنیام خودای پەروەردگار شیفات ئەدات. (پێغەمبەر ئەیوب)یش پێی فەرموو: (عەیبەیە و شەرمەزاریە ٧٠ ساڵ لە ناو نیعمەت و بەروبووم ژیاندوومی، ئێستاش ٧٠ ساڵ لە نارەحەتی و ئازاری بەرگە نەگرم؟) هەتا لە کۆتایش لە ڕووی نەهات و تەنها فەرمووی: (خودایە من توشی نارەحەتی هاتووم و تۆش ارحم الراحمینی)

خودای گەورە شیفای بۆ نارد و پێی فەرموو:) هەستە لەو ئاوە بخۆرەوەو خۆت بشۆرەوە (پاشان بووەوە بە خاوەنی کۆمەڵێک کچ و کوڕ و سەروەت و سامانێکی زۆر زیاتر لە وەی پێی درابوو لە ڕابردوو، گەرایەوە بۆ سەردەمی پێش ١٨ ساڵەکە بە دووقاتەوە لە پاداشتی ئەو سەبرە عەزیمە. ئێمەش ئەگەر شتێکی بچوکمان لە کیس بچێ، یا هەوڵ بۆ شتێک بەین و پێی نەگەیشتین، یەکەم جار خۆمان مشەوەش ئەکەین و ناڕەزایی دەرئەبڕین، ئینجا ئەڵێین خودایە بۆ؟! (پەروەرێنم لێت ئەپاڕێمەوە سەبری (پێغەمبەر ئەیوب) بە هەموو موسڵمانان و منیش ببەخشیت)

# سوێند خواردن بە غەیری خوا

خودای پایەبەرز دەفەرمووێت: (قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ) (التغابن ٧) واتە: (ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ: بەڵێ سوێند بە خودای پەروەردگارم زیندوو دەکرێنەوە) وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللَّهِ فَقَدْ أَشْرَكَ) (صحيح رواه أحمد) واتە: (هەر کەسێک سوێند بخوات بە غەیری خودا ئەوا شیرکی کردووە) لەم ڕۆژەدا دەیبینین کەسانێکی زۆر گیرۆدەی قسەی باو باپیریانن کە وایان وتوە و لەسەری بەردەوام بوونە، بۆ نموونە سوێن بە تەڵاق دەخورێت، یان بە پێغەمبەر، یاخود بە قەبری باوکم، سوێن بە کەعبە، یان بەم زادە هتد.... کاتێک تۆ سوێنێک دەخۆیت بە غەیری خودا و قورئان، واتە: ئەو شتە دەکەیتە قاڵبی خوداوە، واتە هەمان مانای خودای هەیە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (مَنْ كَانَ حَالِفاً فَلْيَحْلِفْ بِاللَّهِ أَوْ لِيَصْمُتْ) (صحيح البخاري ٢٦٧٩) واتە: (هەر کەسێک سوێندی خوارد ئەوا با سوێند بە خودا بخوات یاخود با بێ دەنگ بێت)

## ئەشق و خۆشەویستی

دەبێت بزانین ئەشق و خۆشەویستی جیاوازە، نابێت ئەشق بۆ شت بەکاربهێنین، ئەشق تەنها بۆ ڕەگەزی بەرامبەر دەبێت، بەڵام خۆشەویستی بۆ هەموو شتێک بەکاردێت، واتە دەتوانین بڵێین: ئێمە خودا و پێغەمبەرمان (ﷺ) خۆش دەوێت، بەڵام ناتوانین بڵێین ئاشقیانین! ئەم هەڵەیەش زۆر بەکاردێنین خوشەویستی و ئەشق هەندێ کەس هەن ناشرینیان کردووە، ئەگینا شتێکی جوانە چوونکە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بە ئاشکرا دەیفەرموو: من عایشەم خۆشەدەوێت. بەڵام ئەشق ناشرین کراوە لەم ڕۆژەدا ئەگینا ئەشق جوانە ئەشق خۆشی بەخشیشە، ئەشق لەگەڵ ئینساندا دێتە دونیا، یانی مەحاڵە ئینسان ئاشق نەبێت، وە ئەو ئینسانەی ئاشق دەبێت خۆشبەخترین کەسە، ئەشق بەدبەختی زۆرە لە چەندەها ئەشق پاشان دانەیەکیان سەر دەگرێ، کێشەی زۆرە، بەڵام لەزەت و خۆشی بەخشیشە بۆ کەسانێک کە ئاشقی یەک بن، بەڵام کاتێک کە هاوسەری یەک بن یاخوت دەزگیرانی یەک بن، ئینسان خالق دەبێت، ئینسانی ئاشق خالق دەبێت. خۆشەویستی ڕاستەقینە وەک ئەو خۆشەویستیەی کە هەبوو لە سەردەمی پێغەمبەردا

(ﷺ) کاتێک لەشەڕی بەدردا ٢ منداڵ دەڕۆنە لای (عەبدول ڕەحمان) دەڵێن: مامە گیان ئەبو جەهل لە کوێیە ئەویش دەڵێت: تەعجوبم هات کە وایان وت! منیش وتم بۆچیتانە؟ وتیان: وەڵا بیستومانە دەلێن قسەی بە پێغەمبەرمان کردووە، ئیمەش دەمانەوێت بی کوژین، (عەبلدول ڕەحمان) ئەوی بینی کە ئەبوجەهل لەبان ئەسپەکەیەتی لە ناو شەرەکەدا وتی: ئەوە ئەبو جەهلە دەلێت منداڵەکان ڕایان کرد، ڕایان کردە ناو شەڕەکە بە شمشێرەکانیانەوە، ئەبو جەهلیان بەردایە خوارەوە و کوشتیان، کاتێک شەرەکە تەواو بوو، چوون بۆ لای پێغەمبەری خودا (ﷺ) وتیان: پێغەمبەری خودا (ﷺ) من کوشتومە ئەوی تریان وتی من کوشتومە، پێغەمبەری خودا سەیری شمشیرەکانیانی کرد هی هەردووکیان بە خوێنەوەیە فەرمووی: هەردووکتان کوشتوتانە. باسەیری ئەم دەرسەکەین چەن جوانە مرۆڤ پیویستە لیی فێرببێت ئەمانە تەنها ٢ منداڵ بوون قاعیدی جێشێک نەبوون تەنها ٢ منداڵ توانیان چی بکەن بەس لەبەر ئەوەی کەسێک قسەی بە پێغەمبەری خودا کردبوو، چیان کرد تا تۆڵەی بکەنەوە کە قسەی ناشرینی پێی وتبوو، ڕاستە قسەی بە باوکی نەکردبوو بە کەسوکاریان نەکردبوو، بەڵکو بە پێغەمبەریانی کردبوو، بۆیە ئێمەش دەبێت وابین

پێغەمبەری خوامان لە هەموو کەسێک خۆشتربوێت. هەندێ کەسانیش هەن وەک سەحابە و هاوەڵانی پێغەمبەر کە ژیانیان بەخت دەکرد لەبەر پێغەمبەریان (صلى الله عليه وسلم) ئەمەی بینیتان خۆشەویستی بوو بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم). ئەشق زۆرجار لە یەک کەسەوە سەرەتا دەسپێدەکات پاشان بەرامبەر، زۆر جار ئەو کەسە بۆ تۆ نابێت یان ناگونجێت ئەوە دڵنیابە خێری تۆی تێدایە، بۆیە نەگەنجاوە خودا خۆی وا دەفەرمووێت. هاوەڵێکی پێغەمبەر قسەیەکی جوانی هەیە دەڵێت ئەگەر داوای شتێکم لە خودا بکردایە، ئەگەر ئەو شتە بووە قسمەتی من ئەوا جارێک دڵخۆش دەبووم، ئەگەر نەبووایەتە قسمەتم ئەوا ٢ جار دڵخۆش دەبووم. دایم ئەو وتەیە بخەرە ئەندێشەتەوە بۆ ئەوەی هەمیشە لە بیر و هزردابێت  بە خۆت بڵێ: خودا هەر چی کردە قسمەتم ئەوا خێری تێدایە بۆ من ئەوا ئەوکات سوودم پێدەگەیەنێت، هەمیشە هیوات هەبێت هەمیشە باوەڕت وابێت لەگەڵت دایە بەخودا خۆشی ئەوێیت، بەخودا کاتێک هەڵەیە یان تاوانێ دەکەیت چاوەرێیە تا بگەڕێتەوە، چاوەرێیە تا تەوبە بکەیت، چاوەرێیە بگەرێیتەوە بۆلای و داوای لێبوردن کەیت. نەڵێیت خودا کاتی نیە بۆ من، خودا هەموو کات بە ئاگایە خودا هەموو کات کاتی هەیە بۆ تۆ تا بگەرێیتەوە بۆلای، هەر کاتێ

بتەوێت ٥ بەیانی، ١ نیوەرۆ، ١٠ی شەو، وەلا گوێت لێدەگرێت کاتێک تاوانێک دەکەیت مەلایکەتەکان یەکسەر تاوەنەکەت بۆ نانوسن، لەسەر شانی چەپت دایئەنێن خورات شەوەندە بە ڕەحمە بۆت، جا ئەو خراپەکانت نەداتە ڕووتا، کەسێک لەم ڕۆژەدا هەڵەیەک بەرامبەری بکەین هەموو دونیا تێدەگەیەنێت هەموو چاکەکانی دەدات بە ڕووتدا، خودای گەورە هەمیشە بەبەزەییە لەگەڵ بەندەکانی، چونکە ئێمەی بە جوانترین شێوە خوڵقاندوە، هەر بۆیە مرۆڤ شایستەی ڕێزە نەکو بەزەیی ئەوەی خاوەنی بەزەییە تەنها خودای گەورەیە. خودا شتێکی وا قورس نادات بە سەرمانەوە کە نەتوانین هەڵی بگرین هەر کێشەیەک و نارەحەتیەک بۆمان دەنێرێت دڵنیابە خێرێکی ئێمەی تێدایە، هەر چەندە یەقین و باوەڕت هەبێت کە خودا یارمەتیت دەدات لەوەی ئەو بەردە هەڵگریت کە لەسەر ڕێگاکەتدایە دڵنیابە یارمەتیت دەدات، وەڵا تۆی دروست کرد لەناو ئەو هەموو دروستکراوانەیدا تۆی کردووەتە مرۆڤ، چونکە مرۆڤی بە جوانترین شێوە حوڵقاندووە. (وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ) (قلم ٤) واتە: (بەڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشت و خوویەکی زۆر جوان و پەسەند و بێ وێنە و مەزنیت)

# خۆشنەویستنی کافران

(لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُولَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُمْ بِرُوحٍ مِنْهُ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ أُولَئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ) ( المجادلۀ ٢٢)

(لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ) واتە: (نابینی کەسانێک هەبن کە ئیمانیان بەخودا و بەڕۆژی دوایی هەبێ وە خۆشەویستیان بۆ کەسانێک هەبێ کە دژایەتی خودا و پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه وسلم) ئەکەن) واتە: نابێ باوەڕدار خۆشەویستی بۆ کافرهەبێ، نابینی واتە: نابێ ببینی و شتی وا نابێت کە خۆشەویستیان بۆ کافران هەبێت، ئەو کاتە باوەڕەکەیان بەتاڵ ئەبێتەوە، باوەڕ و خۆشەویستی کافران پێکەوە لە دڵدا کۆنابنەوە و دژ بەیەک و پێچەوانەن (وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ) واتە: (ئەگەر ئەو کەسە کافرانە باوکیشتان بێ کە کافر بوو نابێ خۆشتان بوێن) ئەمە لەسەر (ئەبو عوبەیدەی

کوڕی جەراح) دابەزی لە شەڕی بەدردا باوکی خۆی کوشت. (أَوْ أَبْنَاءَهُمْ) واتە: (یان با ئەو کەسە کافرە کوڕیشت بێ نابێ خۆشت بوێ) لەسەر (ئەبوبەکری صدیق) دابەزی کە لە شەڕی بەدردا ویستی (عبدالرحمنی کوڕی) بکوژێ هێشتا موسڵمان نەبوو دواتر موسڵمان بوو. (أَوْ إِخْوَانَهُمْ) واتە: (یان با برایشیان بێ) لەسەر (موصعەبی کوڕی عوبەیر) دابەزی کە (عوبەیدی کوڕی عومەیری) برای کوشت. (أَوْ عَشِيرَتَهُمْ) واتە: (با ئەو کەسە کافرانە ئەگەر عەشیرەت و هۆزیشت بوو نابێ خۆشت بوێ) (ئیمامی عومەر و ئیمامی حەمزە و ئیمامی عەلی و عوبەیدەی کوڕی حارس) لە جەنگی بەدردا خزمی خۆیان کوشتووە، وە هەموویان خزم و کەسوکاری یەکتری بوونە. (أُولَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ) (ئەم کەسانە کە بەم شێوازەن خۆشەویستیان بۆ کافران و بێباوەڕان نیە ئەمانە خودای گەورە ئیمانی لە دڵیاندا جێگیر کردووە و ڕازاندۆتەوە و کۆکردۆتەوە و بەختەوەری کردوون) (وَأَيَّدَهُمْ بِرُوحٍ مِنْهُ) واتە: (وە بەهێزی کردوون بەسەرکەوتنێک لەلایەن خۆیەوە، چۆن مرۆڤ بە ڕوح ئەژێتەوە موسڵمانیش بە سەرکەوتن ئەژێتەوە، بۆیە سەرکەوتنی بە ڕوح

ناوبردووه) (وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا) واتە: (وە خودای گەورە لە ڕۆژی قیامەت ئەیانخاتە بەهەشتەوە کە پڕە لە باخ و باخات کە جۆگەلە ئاو بە ژێر دار و خانووەکانیاندا تێ ئەپەڕێ وە بە نەمری و هەمیشەیی تێیدا ئەمێننەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ) (ئەوان بەهۆی ئیسلام و ئیمانەوە کەسوکاریان لێیان تووڕەبوو، خودای گەورە قەرەبووی بۆ کردنەوە کە خۆی لەوان ڕازی بوو وە ئەوانیش ڕازین بەو بەشە و پاداشتەی کە خودای گەورە پێی بەخشیون) (أُولَئِكَ حِزْبُ اللَّهِ) واتە: ئا ئەمانە حیزب و سەربازی خودای گەورەن (أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (٢٢)) ئاگاداربن وە بزانن سەربازان و کۆمەڵی خودای گەورە ئەوانەن کە سەرکەوتوو سەرفرازی ڕاستەقینەن لە دونیا و قیامەتدا. والله أعلم

## ئایە ڤالانتاین دروستە؟

پرسیار لە شێخ (ابن عثیمین) کرا رەحمەتی خودای لێبێ :بەو دواییانە ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی جەژنی خۆشەویستی ڤالانتاین بڵاوبۆتەوە لە نێو قوتابیاندا، کە جەژنێکە لە جەژنەکانی گاورەکان، وە جلیان بەتەواوی ڕەنگی سوورە، جل و پێڵاویان سوورە، وە گوڵی سوور بە یەکتر دەدەن، ئومێدمان وایە لە بەڕێزتان حوکمی ئاهەنگ گێڕان لە نموونەی ئەو جەژنە ڕوونبکەیەوە، وە ئامۆژگاریتان چیە بۆ مسوڵمانان ؟

وەڵام: ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی جەژنی خۆشەویستی ڤالانتاین دروست نیە لە چەند ڕوویەکەوە:

١. ئەوە جەژنێکی بیدعەیە و هیچ بنچینەیەکی نیە لە شەریعەتدا.

٢. بانگەشە دەکات بۆ عەشق و پەیوەستبوون بە یەکتر.

٣. بانگەشە دەکات بۆ سەرقاڵکردنی دڵ بەو جۆرە کارە بێسوود و بێ نرخانە کە پێچەوانەی ڕێگەی سەلەفی صالحە ڕەزای خودایان لێبێت.

حەڵاڵ نیە لەو ڕۆژەدا هیچ شتێک لە دروشمەکانی جەژن بکرێت، جا لە خواردن بێ یا لە خواردنەوە یا لە پۆشینی

جلوبەرگ بێ یا لە دیاری بەخشینەوە بە یەکتر و جگە لەوانەش پێویستە لەسەر مسوڵمان سەربەرزبێ بە دینەکەی و ساویلکە نەبێت، شوێن هەموو قسەکەرێک بکەوێت. بەو هیوایەی هەر شتێک لە ڕووی دینمانەوە دروست نەبوو بە ئەنجامی نەگەیەنین.

# سحر و جادوو

خودا خۆی دەزانێت چی حەرام کردووە لێمان کە ئەم هەموو شتە لەبەر چی کراووە لەبەر من و تۆ بۆیە هەرگیز خۆت بەکەم مەزانە بیربکەوە ئەم گەردوونە بۆ ئێمە دروست کراووە، شتێکی تر لەو شتە حەرامانە کە لەم سەردەمەی ئێمە باوە هەندێ کەس خەریکی سحر و جادون کە ئەمە لەم ڕۆژگارەدا هەیە و زۆر بەکاردێت، کە ئەمەش چەن کەسێکی نەفام و گێلن کە دەکەونە داوی ئەم جۆرە کەسانەوە، بەڕاستی شتێکی زۆر ناشرینە کە سەرەڕای ئەمەش پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (من أتى عرافا فسأله عن شيء لم تقبل له صلاة أربعين يوما) (رواه مسلم) واتە: (چونە لای ساحیر ٤٠ ڕۆژ نوێژی قبوڵ نابێ ئەو کەسە بەس سەردانی بکات، ئەگەر باوەری پێ بکات بە کافر دادەنرێت) ئێ تەواو کە ئەو وای فەرموو ئیتر باخۆمان لێی بە دوور بگرین. خودای گەورە دەفەرمووێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ وَاشْكُرُوا لِلَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ) ( البقرة ١٧٢) واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، بخۆن لەو ڕزق و ڕۆزیە چاک و باشانەی کە پێمان بەخشیوون و بەردەوام

سوپاسگوزاری خودا بکەن ئەگەر ئێوە تەنها ئەو دەپەرستن. پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: هەر شتێکم لیتان قەدەغە کرد خۆتانی لێ بپارێزن، وە هەرشتێکم لێتان داوا کرد ئەوا بەگوێرەی توانای خۆتان جێبەجێی بکەن. بەڵام بەداخەوە هەندێ جار هەڵوێستی خراپ و نەگونجاو لەناو خەڵکیدا دەبینرێ، بەرامبەر بە حەرامکراوەکان، هەندێ کەس کاتێک گوێبیستی حەرامکراوەکان دەبن و پێیان دەوترێ: ئەوە حەرامە دەسبەجی هەڵەچن و هەراسان و بێتاقەت دەبن و دەڵێن: خۆ تۆ نایەیتە قەبری من تۆهەقت چیە؟ برۆ بە ڕێی خۆتدا، دەلێن: دین ئەوە نیە کە وا دەلێن و وا ئەو شتە حەرام دەکەن، دا دەزانن بە دەستی ئێمەیە کە حەڵاڵ و حەرام دیاری بکەین. خودا دەفەرمووێت: (قُلْ أَرَأَيْتُم مَّا أَنزَلَ اللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَالًا قُلْ آللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى اللَّهِ تَفْتَرُونَ) (یونس ٥٩) واتە: (بڵێ پێیان: هەواڵم بدەنێ، ئێوە چۆن لە خۆتانەوە ئەو ڕزق و ڕۆزیەی کە خودا پێی بەخشیوون دابەشی دەکەن و هەندێکی بە حەرام دادەنێن و هەندێکی بە حەڵاڵ کە چی باوەڕتان بە بەرنامەی خودا نیە، پێیان بڵێ: ئایا خودا خۆی مۆڵەتی ئەو کارەی پێداون؟ یا خود لە خۆتانەوە شت بەدەم خوداوە

هەڵدەبەستن؟) خودا خۆی حەکیم و کار لە جێیە و خەبیر و شارەزایە بۆیە هەرشتێکی ویست ئیرادەی لەسەربێ حەلاڵی دەکات و هەرچیشی بویێت حەرامی دەکات، وە بەندایەتی ئێمەش بۆ خودا ئەوەیە کە ڕازیبین بەوەی خودا ئەوەی حەرامکردووە بۆمان و چیشی بۆ حەڵال کردووین.(وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَاسْتَكْبَرُوا عَنْهَا أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ) ( الأعراف ٣٦) واتە: (ئەوانەش بڕوایان بە ئایەت و فەرمانەکانی ئێمە نەبووە، لووت بەرز بوون بەرامبەریان ئا ئەوانە نیشتەجێی ناو ئاگری دۆزەخن و بە هەمیشەیی تیایدان) چیرۆکی یەکێک کە بوو بە سحرباز و وە دواتر تەوبەی کرد، دەڵێت: سەرەتا ٤٠ شەوی یەکەمی دەچووم بۆ ئەشکەوت، وە ئەو ٤٠ شەوە خۆم پاک نەدەکردەوە دەڵێت: بۆنێکی پیسم لێ دەهات، ئەمەندە بۆنم ناخۆش بوو خۆم نەمدەتوانی بۆنی خۆم بکەم، دوای ئەوەی دەسم لەگەڵ شەیتان تێکەڵ کرد، وە دواتر لەبەرامبەر ئەو کەسانەی دەهاتن بۆلام بۆ ئەوەی سحر و جادویان بۆ بکەم لە بەردەمیان نوێژم دەکرد، بۆ ئەوەی کەبزانن لەگەڵ خودایە نزیکم، بەڵام تەنها (الله اکبر)ەکەم ڕاست بوو، ئەوانەی تر کە دەم ووت هەمووی شرک بۆ خودا بوو. هەمووی هاوەڵم بۆ خودا دادەنا کە کاتێک

نوێژم دەکرد شەیتان لەبەرامبەرم بوو ڕووم کردبووە شەیتان کە نوێژم دەکرد، وە لەبەردەمیشیا چەقۆیەکم دەکردە زگما، بەڵام جن لە گیانما بوو، دەچووە جنەکاندا نەدەچووە خۆما، بەڵام کاری لە من نەدەکرد، تەنها دەمکردە زگی خۆمدا و تەواو ئەگینا هەستم بە هیچ ئازارێک نەدەکرد، بەڵام جارێکیان کەسێک هات بۆ لام هەر هاتە ژوورەوە (ئایەتە کورسی) خوێند یەکسەر جنەکان ڕۆشتن و هیچ لە جنەکان نەمان لە دەوروپشتمان،! ئەمەش هۆکار فەزڵی گەورەیی (ئایەتە کورسی) بوو. ئەبوو هورەیرە ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: ئەوکات حەرەسی بەیتول مال بوو، پیرەپیاوێک ٣ شەو لەسەر یەک هات بۆلام و داوای یارمەتی لێکردم، منیش شەوی یەکەم منیش لە بەیتول مال یارمەتیمدا، پاشان ڕۆشت، کاتێک کە چووم بۆ نوێژی بەیانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پسیاریی لێکردم ئەم شەو کێ هات بۆلات، منیش بۆم باسکرد. پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: گەڕایەوە بۆمی بهێنە. بۆ شەوی دواتر دیسانەوە پیرەپیاوەکە گەڕایەوە، دیسانەوە داوای هاوکاری کرد منیش پێم وتت: دەبێت بتبەم بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زۆرم پێ وتت بەڵام

نەهات لەگەڵمدا. کاتێک بۆ نوێژی بەیانی ڕۆشتمەوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرمووم بۆ نەتهێناوە. منیش پێیم وتت، زۆرم هەوڵ لەگەڵیدا بەڵام نەهات. پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێمی فەرموو: ئەم شەو دەگەڕێتەوە هەر دەبێت بۆمی بهێنیت. کاتێک بۆ شەوی سێیەم بینیم کە گەڕایەوە وتم: دەبێت ئەم شەو هەر دەبێت بتبەم بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەگەر نەیەیت ئەوا یارمەتیتت نادەم، پیرەپیاوەکە وتی بەرمدە مەمبە بۆلای محەمەد، چەن وشەیەکت فێردەکەم، ئەوا بە خوێندنی هیچ کات شەیتانت لێ نزیک نابێتەوە. (ئەویش ئایەتە کورسی)ە ئەبوو هورەیرە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت: کاتێک گەڕامەوە بۆ نوێژی بەیانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرمووم بۆ نەتهێناوە؟ منیش پێم وتت ئەی پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) کاتێک ویستم بۆتی بهێنم ئەم چەند وشەیەی فێرکردم (ئایاتە کورسی) بۆیە نەمهێنا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (صدقك وهو كذوب، ذاك شيتان) واتە: ڕاستی کرد درۆزن ئەوە شەیتان بووە. (صحيح بوخاری)

# بوختان کردن

سەرەتا بوختیان واتە: کردنی ئەو کارەیە کە بە درۆیەک کەسێک لە کەدار بکرێت و قسەی نادروستی بۆ هەڵببەسترێت و کەسەکە لەوێ مەوجوود نەبێت، واتە: ئامادە نەبێت لەو شوێنەی کە باسی دەکەن. بزانە بوختیان لە تاوانە هەرە گەورەکانە وە زۆر لەغەیبەت کردن گەورەترە، چونکە بەهۆی بوختیان ڕق و قینەی خەڵک بەرامبەر ئەم کەسەی پەرپا دەکرێ وەلە فەرموودە هاتووە (٥ شت کە فارەتی نییە بەهۆی گەورەی تاوانەکەی، شەریک بۆ خودا دانان، کوشتنی خەلک بە ناحەق، وە بوختیان کردن بە ئیمانداران، هەڵاتن لە بەرامبەر کافران، درۆکردن لە پێناو بەدەست هێنانی مالی خەلک بە ناڕەوا)<

هەروەها پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: (هەرکەسێک باسی کەسێک بکات بۆ ئەوەی عەیبداری بکات، خودای گەورە لە جەهەنەم دەیهێڵێتەوە و حەپسی دەکات)

بۆیە گوتراوە: سەری هەموو تاوانێک درۆیە، وەلەناو درۆش بوختیان لەهەمووی گەورەترە. وەسەری هەموو

تاوانێک زمانە، گەر توانیت زمانت بگریت لە خراپە، ئەوە بزانە نزیک بوویەوە لە بەهەشت. لەم ڕۆژگارەی ئێستادا دەیبینین بە شێوازێکی زۆر بەربڵاو بڵاوە بووە و کە ڕۆژانە لە قسەکانماندایە و بەکاری دەهێنین، ئاگاداری ئەوە نین کە چی تاوانێک ئەنجام دەدەین.

پاشان بوختیان لە قورئان بەم مانایانە هاتووە:

١. بەمانای زینا هاتووە: خودای گەورە دەفەرموویێت: (وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ يَفْتَرِينَهُ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ) واتە: (هیچ جۆرە بوختانێک نەکەن لە نێوان دەست و پێی خۆیاندا (واتە دووره پەرێزبن لە هەموو جۆرە خیانەتێک) واتە دوربن لە داوێن پیسی.

٢. بەمانای حەرامەکان دێت: خودای گەورە دەفەرموویێت: (فَلَا تَأْخُذُوا مِنْهُ شَيْئًا أَتَأْخُذُونَهُ بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُبِينًا) کە بەمانای حەرام هاتووە.

٣. بە مانای درۆیەکی نارەوا و فاحشە دێت: خودای گەورە دەفەرمووێ: ( وَلَوْلَا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُم مَّا يَكُونُ لَنَا أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَذَا سُبْحَانَكَ هَذَا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ) واتە: (دەبوا کاتێک گوێتان لەو بوختانە بوو، بتانوتایە: ئێمە بۆمان نییە قسەی وا بکەین، پاکی و بێگەردی بۆ خودا، ئاخر ئەمە بوختانێکی زۆر

گەورە و ناقۆڵایە کەی ئەوە لە دایکی ئیمانداران دەوەشێتەوە).

بۆیە بابزانین چ سوودێک دەبینین لە  باس کردنی خەڵکی نازانین ڕۆژێک دادێت لە ڕۆژێکدا کە زمان و دەست و قاچمان دەبێتە شایەت، لە بەرامبەر ئەو کردەوانە کە ئەنجامیان دەدەین، نازانین ڕۆژێک دێت خەڵک چاکەکانمان دەبات، بەهۆی باسکردنی خەلکیەوە، چاکەی خۆمان بۆ خەڵک دەنێرین لە ڕۆژێکدا کە خۆمان پێویستمان بە هەموو چاکەیەکە تاوەکوو دەربازبین لە قیامەتدا. بۆیە هەوڵبدەن زمانی خۆتان بپارێزن لە هەموو جۆرە باسکردنێکی خەڵکی.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویێت: (هەر کەسێک باسی کەسێک یان بوختیان بۆ کەسێکی تر ببەستێت و تەوبە نەکات ٤٠ دانە ساڵ لەناو مزگەوت نوێژ بکات ناتوانێت ئەو گوناحە بسڕێتەوە) پەنا دەگرم بە خودا.

(داواکارم لە پەروەرێنم دەممان لە کردنی بوختیان و هاوشێوەکان بپارێزێت)

# خۆپاراستن لە کەسانی چاوپیس

پەیامبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێ: (العين حق) (رواه مسلم) واتە: (چاوپیسی حەق و ڕاستیە و بوونی هەیە)

شێخ ابن عسیمین بە ڕەحمەت بێ دەفەرمووێ: (چاوپیسی ڕاستە و بوونی هەیە و واقیع و ژیانی ڕۆژانە شایەتی بوونی دەدا. چاوپیسی ئاماژەیە بۆ دەرچوونی شتێک لە کەسێکی حەسودەوە کە حەسودی بە کەسانێک دەبات بەو نیعمەت و بەخششەی کە خودای گەورە بە فەزڵ و بەخشندەیی خۆی پێی بەخشیون. چاوپیس کەسێکی خراپە و نایەوێ کەسەکان چێژ ببینن لە بەخششەکانی خودا، کە هەرکات نیعمەت و بەخششێکی لە نیعمەتەکانی بینی کە لە لایەن خودای گەورەوە دراوە بە کەسێ ئەوا ئەو حەسودیەی کە لە ناخیدایە دەریدەکات هەتا کاردەکاتە کەسی چاولێدراو.

چۆنێتی خۆپاراستن لە چاوپیس:

١. بۆ کەسی چاوپیس: ڕێگەی ڕزگاربوون لە چاوپیسی لەلایەن کەسی چاوپیسەوە ئەوەیە کە کەسێکی بینی نیعمەت و بەخششێکی خودای پێدراوە دوعای بەرەکەتی بۆ بکات و بڵێ: خودایە بەرەکەت بڕژێنی بەسەر فلان

کەسدا، یاخود هەر وتەیەکی تر کە نفس و ڕۆحی پێی دڵنیا و ئارام بکاتەوە و حەسودیەکەی بنبڕ بکات و حەسودی پێ نەبات.

٢. بۆ کەسێ کە بترسێ چاوی لێ بدرێ: چارەسەرەکەی ئەوەیە کە زیکرەکانی بەیانیان و ئێواران زۆر بخوێنێت کە هاتوون لەو بارەوە وەک (آیـة الکرسی و سورەتی الاخلاص و قل اعوذ برب الفلق  قل اعوذ برب الناس) یان هەر دوعا و زیکرێ کە لە سونەتدا لەو بارەوە هاتبێ، کە ئەمەش چارەسەرە بۆ خۆپاراستن لە چاوپیسی پێش تووش بوون بە حەسودی و چاوپیسی. پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویێت: (العین تدخل الرجل القبر، وتدخل الجمل القبر) (صحیح جامع) واتە: (چاو بەنیئادەم دەکاتە گۆڕەوە، حوشتر دەخاتە مەنجەڵەوە)

# نیشانەکانی کەسی چاولێدراو

١. کەسەکە ڕەنگی زەرد دەبێت، کاتێک کە سەردانی دکتۆر دەکات لەکاتی پشکنیندا هیچ گرفتێک لە پشکنینەکەیدا نیە،(ئەرێنیە) و لاواز دەبێت.

٢. دەرچوونی پەڵەی شین لەسەر جەستەی کەسەکە دەردەکەوێت.

٣. بوونی سەرئێشەیەکی بەردەوام لەکاتی بەیانیان و ئێواراندا، تێکچوونی کەسەکە کاتێک گوێبیستی قورئانی پیرۆز دەبێت و توشی دڵەنگیەکی زۆر دەبێت، بەتایبەتی لە ئێوراندا.

٤. کەسی توش بوو، هەست بە بێزاری و دڵتەنگی و شەکەتیەکی زۆر دەکات، دوورکەوتنەوە لە کەسە نزیکەکانی، هەندێک جار توشیی گۆشە گیری دەبێت، لەشی کەسەکە گەرم دەبێت و توانای قسەکردنی کەم دەبێت (زمانی دەبەسرێت) و بەرەکەت لە ماڵ و کاسبیدا نامێنێت.

٥. تێکچوونی ئامێرەکانی ماڵی کەسەکە، هەندێ جار دەبێتە هۆکاری بوون بە شەڕ لە نێوان ئەندامانی خێزانەکە بەبێ بوونی هیچ هۆکارێک.

٦. بوونی هاوار و ناڵە بەدەم خەوەوە، بێ ئەوەی خەو ببینێت، باوەڕی بە خۆی نامێنێت، هەم لە خەوتندا و هەم لە واقئدا.

٧. گرنگینەدان بە بوار و ئیش و کارەکانی ڕۆژانەی، ئەمیش وادەکات کەسەکە تووشی لەبیرچونەوەیەکی خێرا دەبێت.

## دۆزەخ

ئاماژەیەکە بۆ ئازار و سزای دەروونی بۆ مرۆڤەکان کاتێک کە هەستێکی شەڕانگێزیان دەبێت، نەک تەنها ئیسلام بەڵکو هەموو ئاینەکان دۆزەخیان هەیە، لای هیندۆسیەکان وایە کە دۆزەخ شوێنێکی زۆر ساردە. لە ئاینی جولەکە و ئینجا کریستیانی دۆزەخ بە ئاگردانرا و بە شوێنێکی گەرم ناوزەند کراوە، ئاینی ئیسلام دۆزەخی بە هەردوو باری گەرم و سارد چواند ناوی لە شوێنە گەرمەکە نا (السعیر) وە بە دۆزەخە سارد و سڕەکەی گوت (الزمهریر) پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر بەردێک هەڵبدەیتە جەهانمەوە ئەوا بە ٦٠ دانە ساڵ ناگاتە ژێر جەهانمەوە. جەهانمیش ئەو شوێنەیە کە کەسانی خراپە کار دەچنە ناوی و تیایدا سزا دەدرێن، کە ئاگرێکە خودای گەورە دایناوە بۆ ئەوکەسانەی کە گوێڕایەڵی ناکەن، جەهەنم بە خودا دەڵێت: ئایە هیچ کەسێکی تر هەیە بۆم بنێری، چونکە جەهانم خواردنی بەرد و مرۆڤە. پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرموێت: (ئەگەر ئەو ئاگرەی لە دونیا هەیە لە جەهانم دا هەبووایە خەڵکی جەهانم تیایدا دەخەوت) واتە: ئەوەندە جیاوازە ئەو

ئاگرەی جەهەنم لە دونیا. خودای گەورە دەفەرموویت: ئەوەی تۆ حەزت لێە لە جەهانمدا نیە یەک تۆز ئیسراحەت نیە یەک تۆز ئاگرەکە لابریت نیە، یەک تۆز ئاونیە، یەک هەناسەی پاک نیە، ئەو هەناسەی کە هەڵیشی دەمژیت هەر ئاگرە. خودا پەناماندات، هەرچی و حەز لیبێت لە جەهانمدا نیە ئەوەی کە ئەتەویت نیە. جا خودای گەورە تۆزێ کانیاو و ڕووباریک پیشان بە جەهانمیەک دەدات وەختە سوێیەبێتەوە دەڵێت: خودایە جا بەشەرمیشەوە قسە دەکات دەزانێت لە دونیا هیچی بۆ خودا نەکردووە، ئەڵێ: خودایە بەس بمگەیەنە ئەو ئاوە، خودایە داوای هیچی کەت لێناکەم بەس بمگەیەنە ئەو ئاوە. خودای گەورەش پێیە فەرموویت: ئەی ئەگەر دوای ئەوەش هەر داوات کرد. هەموو شتێک دەکات بەس بۆ ئەوەی خودا بیگەیەنێتە ئەو ئاوە، خودایە بەس بمگەیەنە ئەو ئاوە داوای هیچی کەت لێناکەم، بەس تۆزێ لەو ئاوە بخۆمەوە، ئاوەکە ئەخواتەوە و ئەیکا بەخۆیا، بەڵام نازانێت ئەو ئاوە گیانیان سەوز دەکاتەوە، پەنا دەگرم بە پەروەرێنم. کاتێک خودا جەهانمیەکان دەبات بۆ سەردان بەهەشتیەکان، جەهەنمیەکان خاڵێکی ڕەش لەناو ناوچەوانیان هەیە، دەناسرێنەوە پێیان دەوترێ: جەهانمیەکان، دوای ئەوەی

که خەڵکی بەهەشت دەچنەوە قەسر وماڵی خۆیان لای خێزان و حاڵی خۆیان ئەحەسێنەوە، ئەوەی کە مسقاڵە زەڕەیەک ئیمانی لە دڵابێت خودای گەورە دەیکاتە بەهەشتەوە، خەڵکی جەهانم هەر چاوەڕێ عەفووکردنی خودا دەکەن، ئەمەنە خودا ڕەحمی نواندوە خەڵکەکەی کە لەناو جەهانمدان چاوەڕێ دەکەن، کە خودا عافویان بکات، شەیتان سەر بەرز دەکاتەوە دەڵێت: دەی خودا عەفویەکم بۆ دەربکات. ئەزانن ئێمە ڕۆژانە چی گوناح دەکەین ڕۆژانە چی گوناح و تاوەن دەکەین نەزەر دەکەین دەڵێین خودایە بمانبەخشە خودا یەکسەر دەمانبەخشێت، ئەگەر مەرجەکانی تیابێت، ئێمە کە ئەو هەموو گوناحە دەکەین و خوداش ئەوەندە میهرەبانە، کە ڕەحمان بەسەردا دەبارێنێت ڕۆژانە هەموو نیعمەتی خودایە بەسەرماندا دەبارێت. خودای گەورە هەرگیز بەندەی باوەڕداری ڕاپێچی دۆزەخ ناکات. ئیلا بەهۆی کردەوەکانی خۆی کە ئەنجامی داون پەلکێشی دۆزەخی دەکەن.

(خودا من و ئێوەش لە ئاگری دۆزەخ بپارێزێت)

## ڕیش هێشتنەوە سونەتە یان فەرزە

خوێنەری ئەزیز ئەم حوکمە لە لایەن زانایانی ئومەتەوە زانراوە و جموری زانایان دەڵێن: لادانی ڕیش حەرامە، لەبەر ئەم بەڵگانەی خوارەوە. هەر چوار مەزهەبەکە دەڵێن حەرامە.

(ئیمامی ابن الرفعة) دەڵێت: ( ئیمامی شافعی لە کتێبی (ئوم) دا دانی بە حەرامێتی لادانی ڕیش داناوە) (حاشية الشرواني على تحفة المحتاج) (٣٧٦/٩)

خوێنەری بەڕێز ئەمەی کە لە سەرەوە باسم لێوە کردووە، وتەی هەر چوار مەزهەبەکەی لەسەرە لەسەر حەرامێتی لادانی ڕیش. بەداخەوەم خەڵک لەگەڵ ئەوەی چەندین فەرموودەی لەسەر هاتووە و لەگەڵ وتەی ئەم کەڵە پیاوانە کەچی خەڵکی هەر داینانێن. پێغەبەر (صلى الله عليه وسلم) پێش ١٤٠٠ دایناوە و فەرمانی پێکردووە حەیف لەوەدایە زۆرینە گوێڕایەڵی نابن، کەچی هەر لە غەرب ڕیش دانرا بۆ مۆدێل.

ئەوەی دروستە لە ڕیش بگیرێت وەک ئاماژەی پێ کراوە لە (مصنف ابن أبي شيبة) (٢٢٥/٥) کە سەحابەکان مشتیان گردوە لە ڕیشیان ئەوەی لە مشتی زیادی

کردووە و دەرچووە بڕیویانە، هەندێک لە زانایان نکۆڵی ئەمەشیان کردووە بەڵام الله أعلم دروستە ئەگەر ڕیش ئەگەر لە مشتێک زیادی کرد لێی ببڕی.

بەڵگەکانی حەرامێتی لادانی ڕیش:

١. عن نافعٍ، عن ابنِ عُمَرَ رضى اللهُ عنهما، عن النبيِّ (صلى الله عليه وسلم) قال: (خالِفوا المُشرِكينَ: وفِّرُوا اللِّحى، وأحْفُوا الشَّوارِبَ) (بخاری ٥٨٩٢) واتە: (پێچەوانەی موشیریکەکان بکەن، ڕیشتان بهێڵنەوە و شواربتان کورت و کەم بکەنەوە) کەواتە ئەو کەسانەی کە ڕیش دەتاشن و سمێڵ دەهێڵنەوە ئەوا پێچەوانەی شەرع دەکەن و چاو لە موشریکان دەکەن و وەک ئەوان دەکەن و وازیان لە سیمای ئیسلامەتی هێناوە بۆ سیمای موشریکان. لەم فەرموودەیە فەرمان کراوە بە هێشتەوەی ڕیش و پێچەوانەی موشریکەکان کردن

٢. عن أبي هريرةَ رَضِيَ اللهُ عنه، عن النبيِّ (صلى الله عليه وسلم) أنَّه قال: (جُزُّوا الشَّوارِبَ وأرْخُوا اللِّحى؛ خالِفوا المَجوسَ) (مسلم ٢٦٠) واتە: (لە سمێڵتان بگرن و ڕیشتان بهێڵنەوە و پێچەوانەی مەجوسیەکان بکەن)

٣. خوای گەورە دەفەرموێت: (قَالَ يَبْنَؤُمَّ لَا تَأْخُذْ بِلِحْيَتِى وَلَا بِرَأْسِى) (٩٤ طه) واتە: (هارون - (صلى الله عليه وسلم) - فەرمووی:

ئەی کوڕی دایکم ڕیش و سەرم ڕامەکێشە) وتی: کوڕی دایکم، بۆ ئەوەی زیاتر سەرنجی ڕاکێشێ و سۆزو بەزەیی بجولێنێت، هەرچەندە برای دایک و باوکی بوو. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دانانی ڕیش نەک تەنها لە کاری پێغەمبەری ئێمە بووە، بەلکو پێغەمبەرانی پێش ئێمەش دایان ناوە.

٥. لادانی ڕیش خۆ چواندنە بە خانمان و خۆ چواندن بە خانمان کارێکی نادروستە و نەفرەتی لەسەر هاتووە وەک (ابن عباس) دەفەرموێت: (لعن رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم المتَشبِّهينَ مِن الرِّجالِ بالنِّساءِ، والمتشَبِّهاتِ مِن النِّساءِ بالرِّجالِ ). (أخرجه البخاري) (٥٨٨٥) واتە: (پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەفرەتی کردوە لەو پیاوانەی کە خۆیان دەشوبهێنن بە ئافرەتان و هەروەها نەفرەتی کردوە لەو ئافرەتانەی کە خۆیان دەشوبهێنن بە پیاوان)

٥. لادانی ڕیش تاوانێکە لە تاوانە گەوراکان، چونکە بە ئاشکرا ئەنجام دەدرێت و سەروەرمان (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (کل أمتي معافى إلا المجاهرين) (متفق عليه) واتە: هەموو ئومەتەکەم خودا لە تاوانەکانیان خۆش دەبێت، تەنها ئەو کەسانە نەبن کە تاوان بە ئاشکرا ئەنجامدەدەن.

٦. عن ابن عمر رضى الله عنه عن النبى (صلى الله عليه وسلم) قال: (خالفوا المشركين ، وفروا اللحى ، وأحفوا الشوارب.) (رواه البخارى ٥٨٩٢ ، و مسلم ٢٥٩) واته: (پێچەوانەی موشریکەکان بکەن ، ڕشتان بهێڵنەوە وسێملتان کورت بکەن) لەم فەرموودەیە فەرمان کراوە بە هێشتەوەی ڕیش و پێچەوانەی موشریکەکان کردن . زانایان لەم فەرموودەیە ئەوە دەردەچێنن کە ئەوەی تاوان بە ئاشکرا ئەنجام بدات، ئەوا ئەو تاوانە دەبێت بە تاوانێکی گەورە، چونکە بە ئاشکرا ئەنجامی داوە، کەواتە لێرەوە دەتوانین بڵێین کە ڕیش تاشین تاوانێکی گەورایە.

تێناگەم سەحابەکان شتێ بۆنی حەرامی لێ بهاتایە نزیکی نەدەبوونەوە، بەڵام ئێستا نازانم خەڵکی بۆ ئەمەندە چاویان قایمە. موستەحیلە دە مەلا بگەڕێ، بەس بۆ ئەوەی حەلاڵی بکەن بۆی، یان لە ترسی قسەی ژنی یان خەڵکی ئامادەیە خودا لە خۆی بڕەنجێنێت.

دەڵێن هۆکاری ڕیش تاشین دەگەڕێتەوە بۆ پاک و خاوێنی، ئایە تۆ خاوێن تری لە رسول الله (صلى الله عليه وسلم)؟! یەک فەرموودە و قسەیەک نیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) یان یەکێک لە سەحابەکان ڕیشیان تاشیبێت، خودا ١٢٤هەزار پێغەمبەری ناردووە سەلامی خودایان

لێبێت، هیچیان بێ ڕیش نەبوونە.

عَنْ نَافِعِ بْنِ جُبَيْرٍ عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ: أَنَّهُ كَانَ عَظِيمَ اللِّحيةِ التعليقات الحسان على صحيح (ابن حبان صحيح لغيره ٦٢٧٨) واتە: لە (نافیعی کوڕی جوبەیرەوە) لە (عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە) فەرمووی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕیشی گەورە و درێژ و چڕ و پڕ بووە.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: زاناکان جێنشینی پێغەمبەرانن. واتە لەدای قسەی پێغەمبەران قسەی ئەوان دێت، زانایانی ئیسلام بابزانین ڕایان چۆن بووە لەسەر ئیسلام؟

(ابن باز) ڕەحمەتی خودای لێ بێت دەفەرمووێت: (واجبە ڕیش بهێڵیتەوە و کورتی نەکەیت و دەستی لێ نەدەیت بۆ کورت کردن)

(ابن عثیمین) ڕەحمەتی خودای لێ بێت دەفەرمووێت: (کورت کردنی ڕیش پێچەوانەی فەرمانی پێغەمبەرە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە وتەکەی: (وفروا اللحى) (أعفوا اللحى) (أرخوا للحى) هەر کەسێک بییەوێت شوێن فەرمانی پێغەمبەر بکەوێت، وە شوێن ڕێنمووی بکەوێت با ڕیشی دەست کاری نەکات و کورتی نەکات) (مجموعە فتاوی ابن عثیمین لاپەڕە ٨٢)

هەندێک زانا دەڵێن دروستە کورتی بکەیت، لەبەر ئەوەی فەرموودە هاتوون، وە لە هاوەڵان هاتووە، وە ئەگەر کورتیشی بکەی ڕیشی هەر هەیە فەرموودەت جێ بەجێ کردووە. دەتوانی لەبەر هەندێک فەرموودە اثر و لەسەر وتەی هەندێک زانا بلێی بەرفراوانی تێدایە وە زۆر جیاوازە لەگەل کەسێک ڕیشی بتاشێ.

(ابن حزم) ڕەحمەتی خودای لێ بێت دەفەرموویێت: ئیجماع هەیە کە سمێڵ کورت کردن و ڕیش هێشتنەوە واجبە.

(ابن تیمییە) ڕەحمەتی خودای لێ بێت دەفەرموویێت: قورئان و سونەت و ئیجماع بەلگەیە لەسەر فەرمان کردن بەوەی کە پێچەوانەی موشریک بکەیت نەهی کردن لەوەی کە خۆت بچوێنی بە ئەوان.

(ابن عثیمین) ڕەحمەتی خودای لێ بێت دەفەرموویێت: (ڕیش تاشین شتێکی زۆر گەورەیە، مرۆڤ ئەگەر بەردەوام بێت لەسەری تاوانێکی گەورەیە، تاوانی گەورەترە لەو کەسەی کە جگارە دەکێشێت،! چونکە ڕیش تاشین چەند فەرموودەی تایبەت لەسەری هاتوون، چونکە موسڵمانان ئەگەر ڕیش بتاشن ئەوە کۆمەلگا دەبێتە کۆمەلگەیەکی غەیر ئیسلامی، چونکە تاشینی ڕیش ڕێگای بێجگە لە پێغەمبەران بووە، پێچەوانەی جگارە کێشان،

ئەگەر دوو کەس یەکێکیان جگەرە کێش بێت و ئەوی تر ڕیشی بتاشێ ویستییان نوێژ بکەن، ئەوەی جگارە دەکێشیت لە پێشترە پێش نوێژی بکات، لەوەی کە ڕیشی دەتاشی، زانایانی (حنابلە) دەڵێن: ئەگەر پیاوێک تاوان بەرامبەر پیاوێک بکات، ڕیشی دەربهێنێ بە جۆرێک ڕیشی نەهێتەوە، ئەوە دەبێت دیەی کامل بدات ( دیە : واتە پارە دان لەجیاتی پیاو کوشت و خوێن ) کە دیەی کوشتن دەکاتە سەد وشتر، کە ئەمە بەناوبانگە لە وتەی (حنابلە) ئەمە بەڵگەیە لەسەر گرینگی هێشتنەوە ڕیش. شرح بلوغ المرام ج١ لاپەڕە ٢٩٢، هەروەها سەیری المغی بکە ج ١٢ لاپەڕە ١١٢

بەکورتی ڕیش هێشتەوە دوو جۆرە:

یەکەم: ڕیش بهێلیتەوە و دەستی لێ نەدەیت واتە کورتیش نەکەیت، ئەمەیان دەتوانی بلێی لەبەر هەندێک فەرموودە و لەسەر وتەی هەندێک زانا بەرفراوانی تێدایە و واجب نییە.

دووەم: ڕیش هێشتەوە واتە کورتە ڕیشێکت هەبێت ئەمەیان واجبە و حەڕامە بیتاشی.

کەواتە تاشین حەرامە و کورت کردن دروستە، بەلام کورت کردنێک ڕەشایی ڕیشی یان زەردایی ڕیشی دیار بێت.

تێبینی: خەلکێکی زۆر ڕیش تاشین لایان شتێکی ئاساییە، بەڵکو کەسانێک دژایەتی ڕیش دەکەن، ڕق لە ڕیش بوونەوە کە دینە کوفرە.

## مەزهەبی ئیمام شافیعی

(ئیبن و ڕیفعە) لە حاشیەی کتابی (الکافیە) فەرموویەتی: أَنَّ الشَّافِعِيَّ – رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ – نَصَّ فِي الْأُمِّ عَلَى التَّحْرِيمِ قَالَ الزَّرْكَشِيُّ وَكَذَا الْحَلِيمِيُّ فِي شُعَبِ الْإِيمَانِ وَأُسْتَاذُهُ الْقَفَّالُ الشَّاشِيُّ فِي مَحَاسِنِ الشَّرِيعَةِ وَقَالَ الْأَذْرَعِيُّ الصَّوَابُ تَحْرِيمُ حَلْقِهَا جُمْلَةً لِغَيْرِ عِلَّةٍ بِهَا أهـ. تحفة المحتاج فی شرح المنهاج. (٣٧٦/٩١) واتە: ئیمامی شافعی (ڕەحمەتی خودای گەورەی لێبێت) لە کتابی (الام) دا بە دەق هێناویەتی (کە ڕیش تراشین یان کورت کردنەوەی کەمتر لە مشتێک) حەڕامە، بەهەمان شێوە (زەرکەشی و حیلمی) لە کتابی (شعب الایمان) وە مامۆستاکەی (قەففال شاشی) لە کتابی (محاسن الشریعة) هێناویانە (کە ڕیش تاشین حەڕامە) وە (ئەزرەعی) فەرموویەتی: بەبێ هیچ عیللەتێک ڕیش تاشین حەڕامە.

ـ وە (ئیمامی نەوەوی) ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێت لە کتابی (منهاجدا) فەرموویەتی: وَكَانَ مِنْ عَادَةِ الْفُرْسِ قَصُّ اللِّحْيَةِ

فَنَهَى الشَّرْعُ عَنْ ذَلِكَ. المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج. (١٤٩/٣) واتە: لە داب و نەریتی فارسەکان ڕیش کورت کردنەوە بوو، بۆیە شەریعەتی پیرۆزی ئیسلام نەهی لەم کارە کرد.

## گاڵتە کردن بەسونەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)

ئەوەی زۆر سەیرە ریشی هیچ کەسێک زیان لە کەس نادات بەڵام بۆ ئەوەندە ڕقیان لێیەتی؟ تۆ ریش ئەهێڵیتەوە یان نا کەیفی خۆتە، بەڵام تکایە حەقت نەبێت بەسەر ڕیشی کەس، نازانم هۆکار چیە بۆچی ڕیش بووەتە شاخێک بەسەر دڵی هەندێک کەس، خۆ ماڵی کاول نەکردوون وا بەرگەی بینینی ناگرن، خێرا دەست دەکەنە توانج دان و تەنانەت جنێو دان بە کەسەکە، دڵنیابە بە ئاسانی لێی دەرناچیت و پێ کافر دەبیت (پەنا بەخوا) کەم نیە تۆ بۆ خۆشی و پێکەنین سوکایەتی بەڕیشی کەسێک بکەیت، کە ئەو لەبەر خۆشەویستی پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) ریشی دانابێت. ئەگەر کەسێک گاڵتە بکات بە ریشدارێک و شەرواڵ کورتێک بزانێت ئەوە سونەتە ئەگەر مەبەستی گاڵتە کردن بێت بە کردەوەکەی واتە ریش و شەرواڵ کورتی یەکەی ئەوا گاڵتەی بە شەریعەت و دینی خوا کردووە، بەڵام ئەگەر مەبەستی

گاڵتە کردن بێت بە کەسەکە نەک سونەتەکە ئەوا کافر و بێباوەڕ نابێت بەوە، تەنها تاوانبار دەبێت. (مجموع فتاوی ورسائل للعثيمين ٢/١٥٩) ئەمەش ڕایەکی زۆر لە زانا و ئیمامەکانی ئیسلام بوو، لەسەر هێشتنەوەی ڕیش و دانانی، ئەوەی بۆمان دانراوە ئێمە دەبێت جێبەجێی بکەین، کەوایە بەو بەڵگە و فەرموودانە ئێمە بۆمان ڕوون بووەتەوە کە هێشتنەوەی ڕیش واجبە و درێژ کردنیشی سەنەتە، بەڵام وەک دەزانین خودا لەو کەسانە عەفوە کە عوزریان هەیە، بۆ نموونە ڕۆژو لەسەر کەسانی موسافیر و نەخۆش فەرز نیە، نوێژ لەسەر کەسانی شێت فەرز نیە، ئەمیش چەند عوزرێکی هەیە، گریمان کەسێک هەیە کە بە هۆی نەخۆشیەکەیەوە دەبێت بیتاشێت و هیچ حەلێکی نیە و ناچارە، یاخود لە وڵاتێکە مەفروزیان کردووە بەسەریەوە کە بیتاشێت، گەر نەیتاشێت توشی زیندان و چەندین کێشەی دەکەن، یاخود کەسێک بەهۆی دەوامەکەیەوە ناچاریان کردووە، گەر نەیتاشێت دەری دەکەن و گەر دەریشی بکەن توانای ئیشکردنی تری نیە بیکات. الله اعلم

بەدەر لەوەش عیلم سەلماندویەتی کە هێشتنەوەی ڕیش چەنێک سودی هەیە لەوەنەش:

١. ڕیش لە ٩٥% زیانەکانی تیشکی بەنەفسجی خۆر

دەگەڕێنێتەوە وەک لە توێژینەوەیەکی هیندیدا هاتووە.
٢. نیشانەکانی دەرکەوتنی پیری دوا دەخات.
٣. پێستی دەم و چاو دەپارێزێ لە زیبکە و پەڵە و چرچ و لۆچی و بەکتریا، زۆر کات موس کە دەیدەی لە دەموچاو لۆچی دەکات و زۆرکات توشی خوێن بەربوونی دەکات.
٤. ڕیش پێست و قورگ دەپارێزێ، لە کاتی سەرما قورگ دەپارێزێ لە کۆکە و پێست دەپارێزێ لە سوربوون و وادەکات لە دەموچاو کە بەرگەی سەرما زیاتر بگرێ.
٥. توێژینەوە بەریتانیەکان ئەوەیان دەرخستووە کە ڕیش یارمەتیدەرە بۆ ئەو کەسانەی کە توشی لاوازی جنس دەبن چونکە ڕیش دەبێتە مایەی ڕژانی زۆرترین نسبەی هۆڕمۆنی التیستوستیرون کە دەبێتە مایەی زۆربونی حەزی جنس.
٦. مرۆڤ دەپارێزی لە نەخۆشیەکانی سینگ لەوانە ڕەبووە چونکە دەبێتە مایەی هەڵمژینی هەوایەکی پاک و ناهێڵێ لە هەوادا گەردیلە خراپەکان بڕواتە بۆڕی لوت و دەم. هەروەها ڕیش ڕێز و پیاهەڵدانی زیاتر بۆ پیاو دەهێنێت، هەربۆیە لەبەر ئەو هۆکارانەی سەرەوە پزیشکان ڕێنمایی پیاوان دەکەن ڕیش بهێڵنەوە.

# کاتیک بومەلەرزە بوو چی کارێک بکەین باشە

زانای بەڕێز (ابن باز) بەر ڕەحمەتی خودا بکەوێت دەفەرمووێت: پێویستە لەسەر موسڵمان لە کاتی ڕوودانی بومەلەرزە و مانگگیران و خۆرگیران و لافاو و باوبارانی توند و سەختدا دەستپێشخەری بکات لە تۆبە و پەشیمانی و داوای سەلامەتی و زۆر زیکر و ئیستغفار کردن وەکو چۆن پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) سەبارەت بۆ خۆرگیران و مانگ گیران دەفەرمووێت: (فَإِذَا رَأَيتُم ذَلِكَ فَاذكُرُوا اللهَ) (صحیحی بوخاری ١٠٤٤) واتە: (جا کاتێ بینیتان ئەو دووانە گیراون یادی خودا بکەن) وەهەروەها باش وایە لەم کاتانەدا ڕەحم بەزەیی بەکاربهێنرێ بەرامبەر بە هەژار و نەداران بە سەدەقە کردن و خێرکردن پێیان)

١. (ارْحَمُوا تُرْحَمُوا) (رواه أحمد) واتە : ڕەحم بکەن ڕەحمتان پێ دەکرێ.

٢. (الرَّاحِمُونَ يَرْحَمُهُمْ الرَّحْمَنُ ، ارْحَمُوا مَنْ فِي الأَرْضِ يَرْحَمْكُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ) (رواه الترمذي) واتە: (ئەوانەی کە ڕەحم و بەزەییان هەیە خودای بە ڕەحم ڕەحمیان پێ دەکات، بەزەییتان هەبێ بەوەی کە لەسەر زەوی دایە ئەوا ئەو خودایەی کە لە ئاسماندایە بەزەیی پێتاندا دێتەوە).

# چیرۆکی پیاوە بەنی ئیسرائیلەکە

ئەبوو هورەیرە خودا لێی ڕازیبێت لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) دەگێڕێتەوە: کە پیاوێک لە بەنی ئیسرائیل داوا لە پیاوێکی بەنی ایسرائیل دەکات کە هەزار دینار، واتە هەزار مسقاڵ ئاڵتونی بە قەرز بداتێ، ئەویش گوتی: بڕۆ شاهیدێکم بۆ بێنە بیکەم بە شاهیدت، گوتی: خودا بەسە بۆ شاهیدیم. کابرا دوودڵ بوو، بەڵام هەزار دینارەکەی بە قەرز داپێی، ماوەیەکیان دیاریکرد تا بۆی بهێنێتەوە، پاشان کابرا ناوچەکەی بەجێ هێشت و سواری کەشتیەک بوو کارەکەی ئەنجامدا و پاشان ویستی بێتەوە بۆ لای خاوەن پارەکە کە قەرزی لێ کردبوو، لە کاتی دیاری کراودا بگاتە ئەوێ، کەچی کەشتی دەست نەکەوت نەیدەزانی چیبکات، چونکە هیچ کەشتیەکی دەست نەدەکەوت، بەڵام بە پشتبەستن بەخودا ڕۆشت تەختە دارێکی هێنا و هەڵی کۆڵی و هەزار دینارەکە و نامەیەکی تیایای دانا بۆ خاوەن قەرزەکە، پاشان شوێنی هەڵکۆڵینەکەی داپوشی و هێنای بۆ دەریا و وتی: ئەی پەروەردگارم تۆ چاک دەزانین، کەوا من هەزار دینارم لە فلان کەس بە قەرز وەرگرد، داوای کەفیلی لێکردم، گوتم: خودا بەسە بۆ کە فیلیم،

ئەویش بە کەفیلی تۆ ڕازی بوو، داوای شاهیدی لێم کرد، وتم خودا بەسە بۆ شاهیدیم، ئەویش بەوە ڕازی بوو، منیش ئەوەتا هەوڵوتەقەلایەکی زۆرم داوە هەرچی لە تواناما بوو کردم بۆ دەست کەوتنی کەشتیەک تا ئەو پارەیەی لە لام بوو بۆی بنێرمەوە، بەڵام نەمتوانی، ئەی پەروەردگارم  وا ئەم تەختەدارە ئەسپێرم بە تۆ، بۆم بگەیەنیتە دەستی خاوەن پارەکە، تەختەداری کردە ناو دەریا،  پیاوی خاوەن پارەکەش لە ماڵ دەرچوو تەماشای کرد، بەڵکو کەشتیەک بێت پارەکەی بۆ بهێنێتەوە، لەکتوپڕ تەختە دارەکەی کە پارەکەی تێدا بوو بەدیارکەوت، ئەویش هێنایەوە ماڵەوە تا بیکاتە سوتەمەنی، کە دارەکەی لەت کرد دەبینێت پارەکە و نامەکەی تێدایە، پاشان پیاوەکەی کە قەرزی لێوەر گتبوو پەیدا بوو، وە زۆر سەری سوڕما بوو!!! کاتێک بە یەک گەیشتن کابرای قەرزوەرگر گوتی سوێند بەخودا تا ئیستا بەوپەڕی توانا مەوە هەولم داوە تا کەشتیم دەست بکەوێت و پارەکەت بۆ بهێنمەوە، بەڵام دوای ئەو کەشتیەی پێی هاتمەوە یەک کەشتیم نەدیووە، وتی: ئایا تۆ هیچت بۆ من ناردووە تا ئێستا؟ وتی: دوای ئەو کەشتیەی من پێی هاتم کەشتی ترم دەست نەکەوتووە، بەڵام تەختە دارێکم هێنا و هەڵم

کۆڵی و نامەیەک و هەزار دینارەکەم لەناوی دانا و بە خودام سپارد وەک چۆن خودام کردبووە کەفیلی خۆم لەکاتی قەرز دانەکەدا، وتی: ئەو پارەیەی کە تۆ لەناو تەختەدارە کە داتنابوو، خودای گەورە بە سەلامەتی گەیاندی وە من بۆیە هاتوم کە هەزار دینارەکە پێت ببەخشمەوە. ئەگەر هەرکەسێک ئەوها باوەڕی بەخودا هەبێت لەوەی بەوشێوەیە بێت لەگەڵی هەر بەوشێوە دەبێت. (وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ) (الطلاق ٣) واتە: (ئەوەی پشت بە خودا ببەستێت خودای بەسە)

## پێغەمبەر شوعەیب

بابچینە خزمەت (پێغەمبەر شوعەیبی) با باسی بەسەرهاتی ئەو زاتە موبارەکە بکەین. (پێغەمبەر شوعەیبی) نەوەی (ئیبراهیم) (خلیل الله)یە لە چوار سورەتی قورئاندا باسی کراوە و ناوی براوە. زۆر گوێڕایەڵە و لەسەرخۆ وهێدی و ئامۆژگاری گەلەکەی دەکرد و ماندوو نەدەبوو. خودای گەورە (پێغەمبەر شوعەیبی) کردە پێغەمبەر و ڕەوانەی کرد بۆ سەر خەڵکی شاری مەدینە. خەڵکی ئەو ناوچەیە زۆر دەوڵەمەندبوون، بەهۆی کەسابەت و موعامەلات و بازرگانیەوە لەگەڵ ئەو هەموو ناز و نیعمەتانەدا بت پەرست بوون و خودایان نەدەپەرست و خوو ڕەوشتیان باش نەبوو، بە تایبەتی لە کڕین و فرۆشتندا زۆر حەرام خۆر و فێڵبازبوون، کە شتیان بە خەڵک دەفرۆشت سوکیان بۆ کێشانە و پێوانە دەکرد. خودای گەورە (پێغەمبەر شوعەیب) کە هەر لە خۆیان بوو، کردی بە پێغەمبەر و ناردی بۆ ئامۆژگاریان، وەک خودای گەورە دەفەرمووێت: ئێمە شوعەیب برای خۆیانمان بۆ ناردن و گوتی ئەی گەلی من خودا نەبێ کەس خوداتان نیە هەر

ئەو بپەرستن من پێغەمبەری خودام ئامۆژگاریتان دەکەم بەقسەم بکەن و دەلیل و بەڵگە و موعجیزەم زۆرن لەسەر پێغەمبەرایەتی خۆم. یەکێک لەو موعجیزانەیە ئەوعەسایە بوو کە بە میرات لە باب و باپیرانیدا دەستی کەوت بوو. دووبارە فەرموویی: ڕجاتان لێ دەکەم لەمڕۆ بە دواوە تەرازو و میزاجتان تەواوبێت، حەقی خەڵک بە ناتەواوی مەدەنەوە و دادوەربن. مەردی خودا بن  بەدئەخلاقی و فەساد لەسەر زەوی بڵاو مەکەنەوە. (پێغەمبەر شوعەیب) فەرمووی: ئەوەی من پێتان دەڵێم: گەر بە قسەم بکەن زۆر باشترە گەر ئیمانتان بە خودا و پێغەمبەر و بەوەی پێتان دەڵێم هەبێ، هەروەها لەسەر ئامۆژگاریان دەڕۆیشت و دەی فەرموو: زۆر عەیبە بەسە چیدی ڕێگە بە خەڵک مەگرن و مەیان ترسێنن، کە دەیانەوێ بێن بۆلای من و موسڵمان بن، ئێوە بۆ دەتانەوێ ڕێگای خواناسین لە خەڵک بگرن و لەڕێ لایان دەن؟ ئێوە یادی ئەو کاتە بکەنەوە کە کۆمەڵێکی کەم بوون خودا زۆری کردن، فەقیر بوون دەوڵەمەندی کردن، بێ دەسەڵات بوون ئیستا خاوەن دەسەڵاتن، تەماشای ئەو گەلانە بکەن، کە لە خودا پەرستن و ڕێگای حەق لایانداوە خودا چی بەسەر هێنان، بۆ پەند وعیبرەت و ئامۆژگاری و دەرس

له بەسەرهاتی ئەوان وەرناگرن و دەس لەو بێ دین و کارە خراپانە هەڵناگرن، ناترسن ئێوەش واتان بەسەربێت، فەرمووی: تازە بوون بە دوو دەستە دەستێکیان باوەڕی بە خودا و پێغەمبەر و ئامۆژگاریەکانم هێناوە و موسڵمان بوون، کۆمەڵێکیش کافر و بێدین و بێ باوەڕن. خۆڕاگرن تا خودا لە هەموو دادگەریەک دادگەرترە، فەرق بکات لە بەینی ئێمە و ئێوەدا و توشی سزا و عەزابتان دەکات، لە جوابی ئەو هەموو ئامۆژگارییە و مەوعجیزەیەدا پیاو ماقولەکانیان توڕەبوون و وتیان دەرد دەکەین، یان دەبێ بڕۆن یان بێنەوە سەر دینی ئێمە، (پێغەمبەرشوعەیب) فەرمووی: جا چۆن ئێمە دێینەوە سەر شتێک کە زۆرمان ڕق لێیە یان چۆن بە زۆر دەمان بەنەوە سەر دینی خۆتان قەت قبولی ناکەین، فەرموویی: گەر بگەڕێنەوە سەر دینی ئێوە مەعنای وایە درۆمان بە دەم خوداوە کردووە! دوای ئەوەی کە خودا لە گومراهی نەجاتی داوین تازە بە ئارەزووی خۆمان ناگەرێنەوە، تازە بگەڕێنەوە مەگەر خودا ئارەزوو بکات، کە ئەوەش قەت نابێ و ئارەزووی مەحاڵە، خودای ئێمە ئاگادارە بەسەر هەمووشتێکدا و ئێمە پشتمان بە خودا بەستووە، و لە شەڕی ئێوە دەمان پارێزێت. ئینجا (پێغەمبەر شوعەیب)

زانی تازە موسڵمان نابن و دەست لەو کردەوە خراپانە هەڵناگرن. ڕۆژێک لە پاش دوو ڕکات نوێژ سەری بەرز کردەوە بۆ ئاسمان، فەرمووی: ئەی خودای گەورە دوعام گیرا بکە و حوکم بکە لە بەینی ئێمە و ئەوەندا دادگەری خۆت بنوێنە، خۆ خۆت لە هەموو دادگەرێ دادگەرتری و دەزانی تازە ئیمان ناهێنن، لە دوای دوعاکەی (پێغەمبەر شوعەیب) کافرەکان وتیان: ئەوەی باوەڕی پێبێنێت ئەوا زەرەر دەکات. بە ئەمری خودا جوبرائیل هات و فەرمووی: خودای گەورە دوعاکەی گیرا کردی خۆت و ماڵ و خێزانەکەت و موسڵمانان لە شار بڕۆنە دەرەوە، لە بەرە بەیانیدا غەزەبی خودا دەگاتە سەریان، وە لە بەرەبەیاندا غەزەبی خودا گەیشتە سەریان، جوبرائیل نەعلەتێکی لێدا و قیراندی بەسەر شاری مەدینەدا و شارەکە کەوتە لەرزین و هەموو خەلکی شار مردن. بۆیە هەر کەسێ بوێری ئەوە بکات لە دژی خودا بووەستێتەوە ئەوا بەو شێوە دەبێت، بۆیە هیچ کەسێک ناتوانێت بەرەنگاری خودایەک بێتەوە کە هەر خۆی هەموو گەردوون و زەوی لە ماوەی حەوت شەو و ڕۆژدا دروست کردووە ئایا هێزێک هەیە بتوانێت ئەوە بکات؟ مرۆڤێک بەو لاوازیەی و بێتوانایەی چۆن بوێری ئەوە

دەکات بەرەنگاری بێتەوە؟

گە نجیک هات بۆلای (پێغەمبەر شوعەیبی) و پیی وت: بە خوداکەت بلێ: بۆچی سزای من نادات لە کاتیکدا من گوناحێکی زور ئەکەم خودای گە ورەش پێی فەرموو: پێی بلێ: چ سزایەک لەوە سەختترە کە من یادی خۆم لە دلّی تۆدا دەرهێناوە.

# سوتانی دەست و زمانی موسا

جارێکیان فیرعەون لە خەونیدا بینی کوڕێکی نەوەی ئیسرائیل دەیکوژێت و کۆتایی بە دەسەڵاتەکەی دەهێنێت. لەبەر ئەوەش بڕیاریدا هەموو نەوەیەکی ئیسرائیل لەدایک بێت لەناوی ببەنوو بیکوژن، بۆ ئەوەی لە ناو نەچێت و دەسەڵاتی کۆتایی پێنەیات. ئەوەی جێی سەرسوڕمان بوو موسا لەو کاتەیە لە دایک بوو! بۆیە دایکی موسا ترسا لە پاسەوانەکانی فیرعەون و بڕیاری دا بیکاتە ناو تورەگەیەک و سپاردی بە خودا، خودا بە ویستی خۆی موسای گەیاندە ماڵی فیرعەون، لەوێش ئاسیای خێزانی فیرعەون چاوی بە موسا دەکەوێت و خۆشەویستی چوو بە دڵیەوە و دڵی پەیوەست بوو بە دڵیەوە. و بایەخێکی زۆری بە موسادا و فیرعەونی ڕازی کرد کە بەخێوی بکات. چونکە ئاسیا نەزۆک بوو منداڵی نەدەبوو. ئاسیا وتی بیهێڵە بۆ خۆمان دەیکەین بە کاهیناتێک چاو دڵمان پێی خۆش دەبێت و دەبێت بە کوڕمان کاتێک گەورە دەبێت. ڕۆژێک فیرعەون لەگەڵ موسا یاری دەکرد، کێشای بە تاجەکەیدا و کەوتە سەر زەوی، ڕیشی ڕاکێشا و ئازاریدا، فیرعەون لێی ترسا کە ئەمە ئەو کەسەیە کە

کۆتایی بە دەسەڵاتی دەهێنێت، بیری لەوە کردەوە کە گەورە بێت کێشەی بۆ دروست دەکات بۆیە بڕیاری دا بیکوژێت پێش ئەوەی کار لە کار بترازێت. فیرعەون بە ئاسیایی وتت: ئەمە دوژمنی منە و دەبێتە هۆی لەناو بردنی دەسەڵاتی من، فەرمانیدا پیاوکوژەکان بهێنن، بەڵام ئاسیا هەوڵیدا هێوری کاتەوە و وتی: لەسەرخۆبە چونکە ئەوە منداڵێکە هیچ لە باش و خراپ نازانیت، لێی پاڕایەوە نەیکوژێت، فیرعەون سوور بوو لەسەر بڕیاری خۆی. ئاسیای خێزانی پێشنیارێکی بۆی کرد، کە قاپێک خەڵوز و قاپێک خورما بهێنێت، ئەگەر خەڵوزەکەی هەڵگرد ئەوا منداڵە و نەفامە، بەڵام ئەگەر خورماکەی هەڵگرد، ئەوا ئاسیای خێزانی ڕازی دەبێت بە کوشتنی موسا، بۆیە فیرعەون بە پێشنیارەکەی ڕازی بوو، بڕیاری دا قاپەکان بهێنن، کاتێک قاپەکانیان دانا موسا ویستی خورماکە ببات، بەڵام ویستی خودا لە پێش ویستی هەمووانە، بۆیە دەستی لە خورماکە هەڵگرت و دەستی بۆ خەڵوزەکە برد، بەڵام دەستی سوتان و فڕێیی دایە سەر زەوی، ئاسیا بە فیرعەونی وتت: ئەوەت بۆ ڕوون بووەوە کە منداڵە و نەزانە؟ ئەویش ئەوەی بۆ ڕوون بووەوە کە منداڵە و هیچ نازانێت، ئەمەش بووە هۆی سوتانی دەستی و زمانی،

بۆیە دەمی تەتەڵەی دەکرد لە کاتی قسەکردندا. بەڵگەش بۆ ئەمە خودای گەورە دەفەرموویێت: (اذْهَبْ إِلَى فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَى) (٢٤) ئەی موسا تۆ نێردراوی ئێمەی برۆ بۆ لای فیرعەون لەبەر ئەوەی ئەو سەرکەشی و کوفری کردووە و سنووری بەزاندووە لە کوفردا. (قَالَ رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي) (٢٥) موساش فەرمووی: ئەی پەروەردگار سینگم فراوان بکە بۆ ئەوەی کە بتوانم باری قورسی پێغەمبەرایەتی و ئازاری خەڵکی هەڵبگرم. (وَيَسِّرْ لِي أَمْرِي (٢٦)) وە کارم بۆ ئاسان بکە. (وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِنْ لِسَانِي (٢٧)) وە گیریەک لە زمانم دایە بیکەرەوە (کە گیری زۆری تیادا بوو داوای یەک دانەی کرد خودای گەورەش یەک گیریەکی لە زمانی کردەوە و هەمووی نەکردەوە بۆی، کە ئەگەر داوای هەمووی بکردایە خودای گەورە هەمووی بۆ دەکردەوە) (يَفْقَهُوا قَوْلِي (٢٨)) تا بتوانم تێیان بگەیەنم و لە قسەی من تێ بگەن) سروشتی پێغەمبەران وایە داوای شتی زۆر ناکەن تەنها بە پێی پێداویستیان داوا دەکەن. ئەوەتا خودا داواکەی موسای قبوڵ کرد، بە پێی ئەوەی داوای کردبوو. بەڵام تەتەڵەی کەم لەسەر زمانی هەرمابوو. فیرعەونیش بە خەڵکەکەی وت: کە زمانی تەتەڵە دەکات لە قسە کرن

وە من باشترم لەو. وەک و خودا دەفەرموێت: منی گەورە و بەرز موقارەنە دەکەن بە ئەمە کە لێی تێناگەن. لەم ئایەتە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبیتەوە کە فیرعەون دەی وت: لە ژیاندنەوەی خەڵکیدا باشترە لە موسا. سەرەڕای تانەدان لە قسەکانی موسا کە پڕو پوچن و بێبنەمان، چۆن بەراوردی دەکەن بەمن. بەڵام لە دوایدا موسا سەرفراو و سەرکەوت و بوو. فیرعەونیش چوو بە ناخی زەویدا.

ئەم چیرۆکە بە دیاری کراوی باسنەکراوە لە قورئاندا، بەڵام زانایانی ئیسلام باسیان لێوەی کردووە و باوەڕی پێی کراوە.

## پێغەمبەر ئیدریس

(پێغەمبەر ئیدریس) سەلامی خودای لێبێت یەکەم پێغەمبەرە و ئاوەڵ کەسە کە لە لایەن خوداوە جوبریل بە وەحی ٣٠ سەحیفەی بۆ هێناوە بۆ ئیرشاد و هیدایەتی ئەولادی قابیلی کوری (پێغەمبەر ئادەم) سەلامی خودای لێبێت بۆ ئەوەی دەی ویست لە بت پەرستی و کوفر هەڵگرن و تەوبە بکەن. بەگوێرەی ئاینی ئەو ڕەفتار بکەن ئەو پێغەمبەرە بە شەش پشت دەگاتەوە بە (پێغەمبەر ئادەم) قورئان بە درێژی باسی ژیان و بەسەرهات و یاسای دینی (پێغەمبەر ئیدریسی) نەکردووە، بەڵام خودا لە ٣ ئایەتدا باسی کردووە.  خودای باڵا دەست دەفەرمووێت: (زۆر سابیر و راسگۆ و پایەبەرز بووە لای خوداوەندی گەورە)

هەروەها کە لە سورەتی مەریەم دەفەرمووێت: ئەی پێغەمبەر تۆ بە هۆی قورئانەوە یادی (پێغەمبەر ئیدریس) بکەوە و بۆ ئومەتەکەت بە یان کە چەن پێغەمبەرێکی ڕاست و ڕازگۆ بووە و ڕودبە و مەقامی لای خوداوە بەهۆی عیبادەتەوە چەند بەرز بووە. وە دەڵێن باپیری (پێغەمبەر ئیدریسی) زۆر پیاوێکی بە دین بووە، خەڵک لە

ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوە دەچوونە خزمەتی و دیاریان بۆ دەبردن، بەڵام پاش ئەوەی کە وەفاتی کرد، کۆمەڵێک هاتن بۆ سەردانی بەڵام کە زانیان وەفاتی کردووە گەڕانەوە و دیاریان لەگەڵ خۆیان بردەوە، کورەکانیان زۆریان پێ ناخۆش بوو کە زانیان ئەو خزمەتەی جاران ناکرێن. شەیتان کاتێک ئەو خەبەرەی زانی یەکسەر خۆی کردە شێوەی شکلی پیاوێکی پیر و چووە لای ئەولادەکانی و گوتی: دەزانن کە خەڵک زۆر لێتان قەلسە چونکە لە دوور وڵاتاندا دێن و چاویان بە باوکتان ناکەوێت، ئەوانیش وتیان جا چار چیە؟ گوتی: بێنن ڕەسم و سوڕەی باوکتان دروست کەن لە دیواری خۆیدا دایبنێن، با خەڵک زیارەتی بکەن. ئەوانیش بەقسەیان کرد و بەو هۆیەوە بتپەرستی بەرە بەرە پەرەی سەند و لەو کاتە (پێغەمبەر ئیدریس) لە بابل دابوو خوداوەندی گەورە بە جبریلدا وەحی بۆ نارد و کردیە پێغەمبەر. (پێغەمبەر ئیدریس) خەڵکی مەنت کرد لە بت پەرستی و بانگی کردنەوە بۆ پەیڕەوکردن لە شەریعەتی (پێغەمبەر ئادەم) کەمێک لە خەڵکەکە دوای کەوتن و زۆربەی خڵکەکە لە قسەی دەرچوون، دەستیان لە بتپەرستی هەلنەگرت. (پێغەمبەر ئیدریس) ناچاربوو لەگەڵ موسڵمانەکان بابل

بەجێ بێڵێ و بچێ بۆ میسر لە بابلەوە ڕۆیشت تا چوونە میسر. لەوێ دەستی کرد بە بانگکردنی خەڵک بۆ خوداپەرستی و لەگەڵ (وەزیفەی پێغەمبەریشدا) دەستی کرد بە بەرگ دورین و خەیاتی. کە ئەوەڵ کەسێک بوو کە لیباسی دوریوە، چونکە خەڵک تا ئەوکاتە پێستی حەیواناتیان لە بەر دەکرد. (پێغەمبەر ئیدریس) لەگەڵ هەر تەقەلێکدا ناوی خودای دەبرد و زکری خودای دەکرد. تا ناوبانگی لە ئەرز و ئاسمان بڵاوبووەوە، کە ڕۆژێک ئیزرائیل عەرزی بارەگای ئەقدەسی کرد و گوتی: ئەی خودای گەورە زۆر ئارەزوو دەکەم ئیزنم بدەیت بچم بۆ زیارەتی (پێغەمبەر ئیدریس)، خوداش ئیزنیدا ئیزرائیل خۆی بردە سەر شێوەی پیاوێک چوو بوو بە میوانی (پێغەمبەر ئیدریس). پێغەمبەر ئیدریس زۆر بەڕۆژوو دەبوو، ئیوارە بەربانگیان هێنایە پێش میوانەکە نانی نەخوارد تا سێ ڕۆژ هیچ ئێوارەیەک نانی نەخوارد، ڕۆژی سێیەم (پێغەمبەر ئیدریس) فەرمووی: دەبێ ناوی خۆتم پێ بڵێیت، ئەویش لە وڵامدا گوتی: من ئیزرائیلم ئینجازەم لە خودای تەعالا وەرگرتووە کە بێم ماوەیەک ڕەفیقی تۆ بکەم. (پێغەمبەر ئیدریس) فەرمووی: باشە بەڵام من بە مەرجێک برادەریت دەکەم گیانم بکێشی و

زیندوم کەیەوە، با بزانم گیان کێشان چەن ناخۆشە تا زیاترعیبادەتی خودا بکەم، ئیزرائیل فەرمووی: ئاخر من بی ئەمری خودا ناتوانم گیانی کەس بکێشم، لە غەیبەوە هات کە ئەی ئیزرائیل بێ ئەمری مەکە، ئیزرائیل گیانی (پێغەمبەر ئیدریسی) کێشا و زیندوی کردەوە، ئیزرائیل لێی پرسی گیان کێشان چۆنە؟ فەرمووی: وەک ئەوە وایە هەر بەزیندویی پێستت لەبەر داکەنن. ئینجا (پێغەمبەر ئیدریس) هات و باوەشی بە ئیزرائیلدا کرد و پەیمانی برایەتیان بەست (پێغەمبەر ئیدریس) فەرمووی: پێم خۆشە بەرزم کەیەوە بۆ ئاسمان و گەشتێک بکەین. ئەویش هەڵی گرد و بردی بۆ ئاسمان لەوێ (پێغەمبەر ئیدریس) فەرمووی: زۆر حەز دەکەم چاوم بە دۆزەخ بکەوێت، چوونە بەر دەرگای جەهەنم و مالیک دەرگای جەهانمیانی بۆ کردەوە تەماشایان کرد و گەرانەوە، ئینجا فەرموویی: زۆریش حەزدەکەم چاویشم بە بەهەشت بکەوێت، هەستان و چوونە بەر قاپی بەهەشت (رضوان)ی بەهەشت بە پیریانەوە هات و دەرگای بەهەشتی بۆ کردنەوە، (پێغەمبەر ئیدریس) چووە ناو بەهەشتەوە تا ماوەیەک نەهاتە دەرەوە ئیزرائیل بانگی کرد، ئەوە بۆ نایەیتە دەرەوە! ئەویش گوتی خودا فەرموویەتی: هەموو

گیان لەبەرێک دەبێت تاڵی مردن بچێژێت من چەشتم، خودا لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێ، دەبێ هەموو کەس دۆزەخ ببینێ، خۆ من چومە ناو دۆزەخەوە، دووبارە خودا فەرموویەتی: کەسێ چوو بۆ بەهەشت تازە نایاتە دەرەوە، منیش تازە ناگەڕێمەوە، خودا فەرموویی، ئەی ئیزرائیل لێی گەڕێ چونکە ئەو بە قسە و ئیزنی من چووە بەهەشت و بە ئەمری منیش نایاتە دەرەوە. وە لەو ریوایەتەی کە زیندوە دەڵێت، تەمەنی موبارەکی ٣٥ساڵ بووە کە بەرز کرایەوە بۆ ئاسمان. (پێغەمبەر ئیدریس) کەسێک بوو نووسینی بە قەڵەم داهێنا. هەروەها ئەوەڵ کەس  بوو دەستی کرد بە خەیاتی و جل دورین، چونکە لە پێش زەمانی ئەودا خەڵک وابوو پێستی حەیوانیان لە خۆیانەوە دەپێچا. هەروەها ئەوەڵ کەس بوو کە عیلمی نجوم ئەستێرە ناسی و ڕیازیاتی زانیوە و تەرازوو میزادی داناوە و ئەسڵەحەی دروست کردووە. لە باسی بەسەرهاتی (پێغەمبەر ئیدریسی) ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە هەر ئینسانێک دڵی لەگەڵ خودا و بەندە کانی پاک بێ پلەی لای خودای گەورە بەرز دەبێتەوە، هەر کەسێ عیبادەتی خودا بکات، نائومێد نابێ لە ڕەحمی خودا. ئەو ئامۆژگاریەمان دەسدەکەوێت کە دەبێ بەنی

ئادەم تا دەتوانێت بۆ سەربەرزی دونیا و قیامەت هەوڵ بدات هەر وەک (پێغەمبەر ئیدریس) لەگەڵ ئەوەشدا کە پێغەمبەر بوو، لە ماوەی تەمەنیدا دەستی لە کار هەڵنەگرت شەو و ڕۆژ خەریکی پەند و ئامۆژگاری خەڵک و خەریکی ئیش و کار و عیلم و زانیاری بوو بۆ پێشکەوتنی نەوەی ئادەم ئەم هەموو کارەی کردووە.

هەندێک لە پەند و ئامۆژگاریەکانی (پێغەمبەر ئیدریس)

* چاکە لەگەل بەندەکانی خودا لەهەموو شوکرانەیەک گەورە ترە.

* قەد حەسودی بە ماڵی کەس مەبەن.

* خۆتان لە کار و قسەی خراپ بپارێزن.

* ئەگەر دوعاتان کرد بە دڵ لەبەر خواوەندی گەورە بپاڕێرەوە.

بە کورتی توانیم باس لەو پێغەمبەرە بکەم کە خۆی ژیانامەیەکی دوور و درێژی هەیە لە پەند و ئامۆژگاری و کارەساتی ناخۆش، بەڵام ئەوەندەی لە توانای من دابوو ئەوەندەی لە خەیاڵمدا بووهەر ئەوەندە بوو، بۆ ئەوەی باسی ئەو پێغەمبەرە نازدارە بکەم، ئەم پێغەمبەرە هەرگیز نەیدەوت خودایە من پێغەمبەرم دەبێ دەوڵەمەندم بکەیت، ئەمە کەی کارە کە من دەیکەم  یاخود من ناتوانم، نەخێر

قەت وای نەفەرمووە هەمیشە بە ڕەنجەشانیی خۆی کاری کردووە، خۆشترین و پڕ بەهاترین پارە ئەو پارەیەیە کە خۆت بەڕەنجە شانی خۆت دەست دەکەوێت باکەمیش بێت. بۆیە ئەم پێغەمبەرە هەمیشە هیوای بە خودا هەبووە کە یارمەتی دەدات. من تەمەنم ١٨ ساڵ بوو کە ئەم کتێبەم نەسیوە، سپاس بۆ پەروەردگارم توانیم ئەم کتێبە بە پشتیوانی خودای گەورە تا ئیرەم بڕیوە کە (إن شاء الله) بە پشتیوانی خودای گەورە دەتوانم ئەم کارەش تێپەڕێنم، چونکە هیچ شتێک بێ پشتیوانی خودای گەورە ئەنجام نادرێت، وە بەبێ ئیزنی ئەو هیچ شتێک ڕوو نادات. من هەمیشە باوەڕم بە خۆم بوو بۆ ئەوەی بتوانم هەموو شتێک بکەم ڕاستە کەسانی دەورو بەر هەمیشە هەوڵی ئەوە دەدەن کە سەربکەویت بەسەر هەموو بەربەستێکدا وە کەسانی دەوروپشتت کە نزیکترین کەس خێزانەکەتە پێویستە پاڵپشتت ببن، بەڵام من حەزم کرد کە هەر خۆم هەوڵ بۆ شتەکان بدەم هەر خۆم هەوڵ بدەم بۆ ئەوەی سەرکەوتووبم، بەسەر هەموو شتێکدا، کە خۆم حەزم پێی کردووە و من ویستم خۆم تاقی بکەمەوە ئایە دەتوانم بە هەوڵی خۆم ئەم کتێبە تەواو بکەم یاخود نا!!! چونکە هەر شتێک بە ڕەنجەشانی خۆت هەوڵی بۆ بدەی،

تام و لەزەتێکی هەیە. هەمیشە هەوڵ بدە پشتت تەنها بە خودات ببەستی، چونکە مرۆڤەکان ماوەیەکی کاتی لەگەڵتن یان تەنها لە خۆشیەکاندا کاتت لەگەڵ بەسەر دەبەن. بەڵام کاتێک دەکەویت، بزانە کەم کەس هەن کە دەست دەگرن، کاتێک ڕۆژە سەختەکانت دێت، ئەوان بیانویەک دەدۆزنەوە بۆئەوەی بڵێن مەجالمان نیە و کاتمان نیە ببورە دڵنیابە مرۆڤەکانی ئەم سەردەمە بەو شێوەیە. ئەگەر بە شێوەیەکی ژیر بیربکەینەوە، تۆ بە تەنها لە دایک دەبیت، بەبێ ئەوەی هیچ شتێک لەگەڵ خۆت بێنیت بۆ ئەم ژیانە، سەرەتا تەنها جەستەت دێتە ئەم دونیا، دوایش کە دەمریت کەسیش نایات لەگەڵت بەتەنها خۆت هاتیت، بە تەنهاش دەڕۆیت. ئەوەی کە گرنگە کە کێ دروستت دەکات و کێ دەت مرێنێت، ئەویش بێ گومان خودایە. بۆیە تەنها بۆ خودا بژی، مەڵێ فلانکەس ئیشی داپێم واتە ژیانم لای ئەوە، دڵنیابە ئەوە خودا ڕسقت دەدات بەڵام ئەوی کردوەتە سەبەب. مەبەستی من لەوەدایە کە ئێمە لە دایک دەبین کەس لەگەڵ مان نیە، بۆیە با بۆ خۆمان بژین نەوەک بۆ خەڵک. خەڵک کاتین تەنها لەم تەمەنە کورتەدا لەگەڵتدایە دوای ئەوە نامێنن، کە مردی هیچیان نامێنێت لەگەڵت، کاتێ

دەمریت تەنها چەن مانگێک بێتاقەت دەبن و دوای ئەوە باری ژیانیان ئاسایی دەبێتەوە و لەبیرت دەکەن. بۆیە لەوە تێبگە کە ژیانت پەیوەست مەکە بە خەڵکیەوە بڵێی بێ ئەو کەسە ناژیم! چونکە خودا بێ ئەویش دەتژیەنێت.

بۆیە هەرگیز ئەو قسانە بەکارمەهێنە بێ ئەو ناژیم یان ئەو ئیشە لەدەستدەم ژیانم وێران دەبێت. تا پشتت بە خودا قایم بێت، هەرگیز هیچ ڕوونادات، ڕاستە هەندێ تاقیکردنەوە ڕوودەدەن لە ژیانت دڵنیابە ئەگەر تۆ کەسێک بیت کە باوەڕت بە خودا بێت، ڕۆژێک دادێت کە تاقیکردنەوەکەت تەواو دەبێت، (وَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ) (البقرە ٢١٦ ) واتە: (ڕەنگە ئێوە شتانێکتان پێ ناخۆش بێت بەڵام بۆ ئێوە واچاکترە) دەبێت بەرگەی هەموو شتێک بگریت، یان جاریوا هەیە کە گوناحێک دەکەیت، خودا شتێکت بەسەر دێنێت، کەوات لێبکات بگەڕێیتەوە بۆلای خۆی، بۆیە هەمیشە لە خۆشی و لە ناخۆشیە هەمیشە سوپاسی خودا بکە، لەواچێ خودا شتێک بکات وابزانیت لە سوود و قازانجی تۆ نییە بەڵام دڵنیابە دیارە ئەوە باشترە بۆ تۆ چونکە خودا هێناویەتیە سەر ڕێت. (مَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ ۗ وَمَنْ يُؤْمِنْ بِاللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُ) (التفاین ١١) واتە: (هیچ بەڵا و موسیبەتێک ڕوونادات

ئیللا بە ئیزن و قەزا و قەدەری خوای گەورە وە هەر کەسێک ئیمان بێنێ بە خوای گەورە و بزانێ ئەمەی توشی بووە لەلایەن خوای گەورەوەیە و ئارام بگرێ و شوکری خوای گەورە بکات و چاوەڕوانی پاداشت بێت)

## سوپاسی خودات کردووە

مرۆڤ پاشای سەر زەویە هیچ شتێک نیە بە مرۆڤ بویرێت. هەرگیز شوکری خودات کردووە، کە تۆی بە مرۆڤی دروست کردووە، تۆی کردووە بەم مرۆڤەی ئەمڕۆ هەتا وەکو ئێستا شوکری ئەوەت کردووە کە بیرکردنەوەت تەواوە، دوای ئەوە کە لەشت ساغە و کێشەت نیە خودا ئەو نیعمەتەی بە تۆ بەخشیوە، ئەو لەشە ساغەی کە تۆ هەتە دەزانیت هەموو دونیا دێنێت. کچێکی گۆرانیبێژی ئەوروپی توشی ژێرپەنجە دەبێت خاوەنی هەموو شتێک بوو، هەموو ئەو شتە مادیانەی هەبوو کە لە سەر ئەم زەویەدا هەیە، تەمەنێکی زۆر نەژیا و ئەو نەخۆشیە زاڵ بوو بەسەر ئەم کچەدا و مرد، دوا قسەی ئەوە بوو سەروەت و سامان هیچ نیە و خۆشیەکی یەکجار بۆ مرۆڤ ناهێنێت، بەڵکو بوونی لەشێکی ساغ هەموو خۆشیەک دێنێت بۆ مرۆڤ. ئێمە نازانین تێناگەین چ نیعمەتێکمان هەیە و قەدری نازانین لە ڕابردووشدا باسی ئەو گەنجە عارەبەی کە چاوی نەبوو، دەیوت: لە نوێژەکانمدا داوا لە خودا ناکەم کە چاوەکانم پێببەخشێتەوە، بۆ ئەوەی خودا لێم نەپرسێتەوە لە قیامەت

چاوەکانت بۆ چی شتێک بەکارتهێنا چاوەکانت لە چیا سەرف کرد. دڵنیابە لەو دونیا ئەو چاوەت شکاتت لێ دەکات، گەر بەشێوازێکی دروست بەکاری نەهێنیت. پارە و مادی خۆشی ناهێنن هەرگیز مەزانە کەسێک پارەی هەبوو تەواو دڵخۆشە ئەو کەسەی هەمووشتێکی هەیە و دونیا بۆ ئەو خۆشە.

دکتۆر ئانوشە پیاوێکی ئێرانیە دەڵێت: هاوڕێیەکم هەیە دکتۆری نەخۆشیەکانی چاوە، یەکێکە لە ملیاردێرەکانی تاران سەرمایەیەکی خەیاڵی هەیە، ژن و کچەکەی لە فەرەنسا دەژین، بەڵام بەردەوام خەمبارە و دڵتەنگە مانگی ٥ بوو هات بۆ لای من گوتی: دکتۆر بابچین بەیەکەوە نانێک بخۆین وتم: بابڕۆین بەڵام من لە ڕێستۆرانت و ئەم شوێنانە نان ناخۆم با نانێک بەرین لەدەرەوە بیخۆین، شەقامێک هەیە دوو نانەواخانە بەرامبەر یەکن، وتم: دکتۆر تۆ لەوەیان دوو نان بکڕە، منیش لەوەی تریان دوو نان دەکڕم، و دەڕۆین من ڕۆیشتم سەیرم کرد نانەواخانەکە داخراوە، گەڕامەوە بزانم دکتۆر چی کردووە، سەیر دەکەم ئەو نانەواخانەیەش داخراوە، بەڵام دکتۆر سەری خستبووە سەر شوشەی نانەواخانەکە و دەگریا!!!

وتم: دکتۆر چیە؟

وتی: وەرە ئێرە و سەیری ئەو دیمەنە بکە!

منیش سەرم خستە سەر شوشەی نانەواخانەکە، بەخودا هەرگیز ئەو دیمەنەم لەبیر ناچێتەوە، بینیم لەناو نانەواخانەکە ١٠ بۆ ١٥ فەردە ئارد لەسەریەک دانراون، شاگردەکە بە جلی ئیشەوە لەسەر فەردەکان خەوی لێ کەوتبوو دەنگی پرخەی خەوەکەی دەگەیشتە لای ئێمە، پێی گوتم: دکتۆر خودا شاهید و ئاگادارە ١٦ ساڵە ئارەزووی خەوێکی ئاوا دەکەم. بۆ جارێکیش بیت ئەم دوعایە بکە، (اللَّهُمَّ ارْحَمْنِـی وَارْزُقْنِـی وَعَافِنِـی وَاهْدِنِـی) واتە: (خودایە ڕەحمم پێ بکە و ڕزقم بدە و لاشەم ساغکە و هیدایەتم بدە)

ئێمەی مرۆڤ واهەستەکەین بەختەوەریمان لەو شتانەدایە کە نیمانە و خۆزگەی پێ دەخوازین، هەر ئەمەش هۆکارە کە نرخی ئەو شتانە نەزانین کە هەمانە و بەکەم سەیریان دەکەین، ئێ سەیری ئەم ڕووداوە بکەن بەراستی ئێستاش ئەوانەی کە دەوڵەمەندن بزانە ئەوە ئازایی خۆت نیە ئەوە ئازای ئەو خودایەیە کە تۆی وا لێ کردووە و تۆی گەیاندوەتە ئەم ڕۆژەی کە تۆی تیایە، ڕۆژێک نیە کە خودا تۆی خافل کردبێ، ئەویش چی دەوێت لێت، تەنها

دەڵێت ڕۆژی پێنج فەرز نوێژم بۆ بکە، شەریکم بۆ دامەنە، لە حەرامەکەن نزیک مەکە و هەندێ شتی لەسەرمان واجب کردووە دەبێت ئەنجامی بدەین، بە ئەنجام گەیاندنی ئەو کردارانەی کە خودای گەورە واجبی کردووە لەسەرمان، ئەویش بە سوودە بۆ تەواوی مرۆڤایەتی، وەهەموو تاکێک لەم سەرزەمینەدا بەڵام بە مەرجێک موسڵمانبێت(مرۆڤەکە) دین هێندە ئەو قورسە نیە کە بیری لێدەکەینەوە، کەسەکان وا دەزانن کە بەختەوەری لەوەدایە کە ئەو شتەی دەتەوێت، بەڵام نیتە و خودا پێتی نەبەخشیوە، نەخێر چونکە خودا خۆی دەزانێت بەختەوەریت لە چی دایە، ئێمە لە عیلمی غەیب نازانین، بەڵکو بە تەنها خودا خۆی دانا و زانایە، بەختەوەری لە وەدایە کە قەناعەتت بەو شتە هەبێت کە هەتە، نەوەک تۆ ناشوکربیت لەوەی کە هەتە دڵنیابە ئەوەی تۆ هەتە هەموو نیعمەتی خودایە، هەزاران کەس ئەوەیان نیە کە تۆ هەتە (وَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ) (البقره ٢١٦ ) واتە: (ڕەنگە ئێوە شتانێکتان پێ ناخۆش بێت بەڵام بۆ ئێوە واچاکترە) تەمەنی دونیا کورتە کە ئێمەی تێدا دەژین. (قُلْ مَتَاعُ الدُّنْيَا قَلِيلٌ) واتە: (ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێیان بفەرموو: ژیانی دونیا کورتە)

(پێغەمبەر نوح) سەلامی خودای لێ بێ، ژنێکی دیت دەگریا، پرسیاری کرد بۆچی دەگریت؟

ووتی: بۆ مردنی کوڕەکەم هێشتا گەنج بوو.

(پێغەمبەر نوح) فەرمووی: تەمەنی چەند بوو؟

ووتی: تەنها ٣٠٠ ساڵ بوو، (پێغەمبەر نوح) فەرمووی: ئەی چی دەڵێی ئەگەر لە ناو ئومەتێک ژیابای کە تەمەنیان لە ٦٠ تا ٧٠ زیاتر نابێ؟

ژنەکە وتی: بۆچی هیچ ئومەتێک پەیدا دەبێ کە تەنها ٦٠ بۆ ٧٠ ساڵ بژین؟!

(پێغەمبەر نوح) فەرمووی: بەڵێ لە ئاخر زەمان.

ژنەکە وتی: جا کەسیان تیا ئەبێ لەم ماوە کورتەش بێ فەرمانی خودا بکات؟!

(پێغەمبەر نوح) فەرمووی: زۆربەیان بێ فەرمانی خودا ئەکەن!

ژنەکە وتی: دیارە ئەمانە دڵیان بەم دونیایە کورتە خۆشە؟!

(پێغەمبەر نوح) فەرمووی: تاکە خەمیان دونیایە و کەمیان بیر لە دواڕۆژ ئەکەنەوە.

ژنەکە وتی: ناکا ناکۆکیش دروست بکەن لە سەر ئەم دونیایە کورتەیان؟!

(پێغەمبەر نوح) فەرمووی: بەلکو یەکتریش ئەکوژن لە سەر شتی زۆر بچوک،

ژنەکە وتی: ئایا خانو دروست ئەکەن بۆ ئەم ماوە کورتە؟!

(پێغەمبەر نوح) فەرمووی: بەڵکو کۆشک دروست ئەکەن بە ئومێدی سەدان ساڵ و ئنجا زۆریشی پێ ناچێ جێی دێڵن.

ژنەکە وتی: دەی بەخودا گەر من بوومایە ژیانم تەنها لە ژێر سێبەری دارێک بەڕێ ئەکرد و هەر هەمووشی لە سوجدەدا دەبووم.

تەمەنمان زۆر بڕوا ٦٠ ساڵ تێناپەڕێت وەک ئێستا دەیبینین ئەستەمە کەسێک ببینین تەمەنی لەوەندە زیاتربێت. کەچی بەرگەی ئەو تاقیکردنەوەیانەی خودا ناگرین، ئەوان تەمەنیان ٧٠٠ بۆ ٨٠٠ ساڵ دەبوو بەرگەیان دەگرت و شوکرانە دەژیان، لە ژیانێکی پڕ لە مەینەتی و ناخۆشیدا ژیانیان بەڕێ دەکرد. لە دونیای ئەمڕۆدا دەبینین کۆمەڵگا هەمووی سەرگەردان بووە، ئەوەندەی ئارەزوی شتی خراپمان هەیە، ئەوەندە ئارەزووی شتی باشمان نیە، هەر بەدوای گەران بە دوای عەیبەی خەڵکەوەین بەڵام هەڵەی خۆمان نابینین، هەر خۆمان تێوەدەگلیەنین لە ژیانی خەڵکیدا بە دوای ژیانی

خۆماندا نارِۆین، ئەگەر ئێمە بڕیار بدەین و هەوڵی ئەوە بدەین کە بە دوای ژیانی خۆماندا بڕۆین، وازبهێنین لەوەی کە بە دوای عەیبەی خەڵکەوە بیین، بە دوای هەڵەی خۆمانەوە بڕۆین و بزانین هەڵەمان چیە دەتوانین هەڵەکانی خۆمان چاک بکەینەوە و لەو تەمەنە کورتەمان هەوڵی باشترین ژیان بدەین، ئەو هەموو ساڵ و مانگە بەڵام تەمەنی ئێمە ئەوەندە نیە کە بیری لێدەکەینەوە. کەچی ئیمە ناشوکری دەکەین ئەو ئێمەی دروست کرد، ئێمەی گەیاندە ئەم ڕۆژەی کە ئێستا هەین، ئەوها پاداشتی دەدەینەوە بەڕاستی ناشوکری شتێکی زۆر خراپە، و ئەنجامی باشی لێ ناکەوێت. هەرچیت بەسەر هات بڵێ: خودایە زۆر شوکرم  ئارامگرتنت بە عیبادەت بۆت هەژمار دەکرێت. ئایە کورێکت نەخۆش کەوتووە بە تاقیکردنەوەیەکی گەورەی دەزانیت ئایە کچێکت لەدەست داوە بە تاقیکردنەوەیەکی قورسی دەزانیت؟ وادەزانی خودا رقی لێتە کە کورێکی لێتسەندوەتەوە، پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) هەموو کورەکانی لەدەستدا باشە خودا رقی لێ بوو؟ کەوای لێکرد؟ بێگومان نەخێر، ئەی کچێکت لەدەسداوە یا کچێکت تەلاقدراوە پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) ٢ لە کچەکانی تەلاقدراوە، ئەمە خودا رقی لێی بوو؟ بەڵکو لەبەر ئەوەی لەلای خودا خۆشەویستە خودا

خۆشەویستانی تاقیددەکاتەوە. کەوایە دلخۆش بە کە خودا تاقیددەکاتەوە دلنیابە هیچ مرۆڤێک نیە بێ تاقیکردنەوە، دڵنیابە هەموو ئەو تاقیکردنەوانە خێریان تێدایە بۆت، خودای گەورە دەفەرموویێت: هەر بەڵا و موسیبەتێک بەسەرتانابێت ئیلا خێری تێدایە. خودا بەوشێوەیە بەرامبەرمان بەڵام کەسمان لە ڕەحمی خودا ناگەین بە باشی، هەموو ماڵی دونیا چاو و دڵی گرتووین، کەسی دەرگای خودای لەبیر نەماوە، بەتایبەت لەم وڵاتەی خۆمان کە لە کوردستانین، کە گەنجیان فرۆشت، گەنجیان نەهێشت، ئەوەی ماوە خەفەتبارە، ئەوەی ماوە هەمووی خەفەت دایگرتووە بێ ئیش و کار، خوداپەرستیمان نەماوە، بەندایەتیمان نەماوە. ئامارێکی کەناڵی ڕوداوم خوێندەوە بە تەواوی تاساندمی! نازانم چۆن باسی بکەم بینیم دەڵێت: لەم چوار پارێزگایەیی خۆمان تەنها ٥ ملیۆن کەسین لە یەک شەو و ڕۆژی تەواو دا ٤٠٠ هەزار کەس سەیری سایتە ئابڕوبەرەکانیان کردووە، کە خۆتان دەیزانن بەڕاستی شتێکی ناشرینە بۆمان بەڕاستی زۆر ناخۆشە، کاتێک بیری لێدەکەیەوە دڵگران دەبین، پێی بێتاقەت دەبین، کاتێک ئەمە دەبینین لە وڵاتەکەمان کە بانگ دەدرێت، کە دەستوری ئاینی ئیسلامبێت، کە خەلکەکەی موسڵمان بن، کە دەزانن خودا دەمانبینێت،

قسەیە هەیە دەڵێت: ئێمە لە خودا نەبێت لە کەس ناترسین بەڵام لەهەموو کەسێک دەترسین بەس لە خودا نەبێت. دڵنیابە ئەوەی بۆمان دانراوە زۆر جوانە، ئەو چارەنوسەی کە خودا بۆمانی دیاری کردووە دڵنیابە یەکێک لەو پسیارانەی لەناو گۆر لێمان دەکەن دەڵێن گەنجێتیت لە چیا بەسەر برد؟ وڵام لای خۆتە، کاتێک کەسێک دەپرسێت لە بەساڵاچویەک دەڵێت: مامە گەنجیت لە چیا سەرف کرد، گەر گەنجی بە خوداپەرستی و دینداری بەرێ کردبێت ئەوا بەخۆش حاڵیەوە جوابت دەداتەوە، بەڵام کەسێک کە گەنجی بەکاری خراپ بەڕێ کردبێتت بێتاقەت دەبێت و هەرگیز حەزناکات باسی بکات یان ناچاردەبێت بە نادروستی جواب بداتەوە، چونکە هیچی لەبەردەما نیە بیلێت. با گەنجیمان لە ڕێگای خودا پەرستیەوە بەڕێ بکەین، بەس دڵنیابن ڕەحمی خودا زۆر گەورەیە بۆ مرۆڤەکان وەک خودا خۆی دەفەرموێت: باشترین مرۆڤ ئەو مرۆڤەیە دان بە تاوانەکەی دادەنێت و تەوبە دەکات.

پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرموێت: ئەگەر کەسێک لەتاوانەوە هیجرەت بکات بۆ کاری چاکە ئەجری ٥٠ی وەک موسعەبی کوری ئوبەیری هەیە، کە تەمەنی ١٨ ساڵ بوو، پێغەمبەری خودا (ﷺ) کردیە قائیدی جێشێک.

گەنجی تۆبەکار ئەوەندە لای خودای گەورە خۆشەویستە، خودای گەورە ئەوەندەی دڵ بە ئێمە خۆشە کە تەوبە دەکەین، کە ئەو هیچ منەتی بە ئێمە نیە، بەڵام خۆشی دەوێین کە لەوهەموو خراپەدا ئێمە تەوبەمان کردووە گەڕاینەتەوە بۆلای، دڵنیابە بە وازهێنان لە تاوانەکانمان خوداش لە سەرجەم تاوانەکانمان خۆش دەبێت، گەر بەقەت کەفی دەریاش بێت. ئازایەتی ئەوە نیە کە لەسەردەمی پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) و خەلیفە و سەحابەکاندا کە ئافرەتی بێ حیجاب نەبووە و ئافرەتی سفور نەبووە، مەگەر هەرکەسێ کە زۆر شعوری نەبێت نەزەرێکی کردبێت ئەوە ئازایەتی نیە ئازایەتی ئەمڕۆیە گەنجەکان لەناو ئەو هەموو فەسادی و کارە خراپانەیە ئێمە کاری چاکە بکەین، کە هەموو کەس ئەمری کاری خراپمان پێدەکات، بەڵام ئێمە بە قسەیان ناکەین لەبەر خودا، ئەمڕۆ ئێمە پیاوی خودابین، خودای گەورە لە قیامەت لەناو ئەو هەموو خەڵکە هەڵتەگرێت دەڵێت تۆ لە دونیا پیاوی من بوویت، من لیرە پاداشتت دەدەمەوە، ئەم گەنجە لەبەر من زینای ناکرد ئەم گەنجە لەبەر من نەزەری ناکرد، پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویێت: هەرکەس خۆی لە زینا بگرێت خۆی لە تاوان بگرێت ئەوا شیرینی ئیمانەکەی لە دڵایە. خۆگرتن لە نەزەر شیرینی

ئیمانت لە دڵا دەچەسپێت، کە دەڵێت خودایە من لەبەر تۆ سەیرم ناکرد، خوداش هەمیشە لەگەڵت دایە، بەڵام نەزەر لەچی دەکرێت لەو ئافرەتانەی کە شەرم لە خودا ناکەن جلانێک لەبەر دەکەن کاشایستەی لەبەر کردن نین. گەنجێکی دوکاندار کە ئەشیای ئافرەتانی هەیە دەڵێت: سوێن بەخودا هەرگیز ناتوانم سەیری ئافرتێکی حیجاب بکەم، هەرگیز خۆم پێناگیرێت کاتێک تەماشای چاوی دەکەم. خودا بۆچی واجبی کردووە لەسەر ئافرەتان، لەبەر قسەی ئەم دوکاندارە، خودا دەیەوێ ئافرەتان خۆیان داپۆشن چونکە پێستی ئافرەت ناسکە، بە حەڵاڵی نەبێت پیشانی کەسانی تری نەدەن لەشی خۆیان تەنها پیشانی مێردەکانیان بدەن، وەڵای سوێن دەخۆم هەر کەسێک لە سفوریەوە بگەڕێتە سەر حیجاب تەواوی ژیانی دەگۆڕێت، لەوەیە بە باشی تێنەگەیت گەر پرسیار لەو کەسانە بکەیت کە لە سفوریەوە بوونە بە حیجاب، ئیستا دەزانن کە شیرینی ئیمانەکەیان لە دڵدا بەدەست هێناوە.

# پاشەکی

خوێنەری هێژا سوپاسی تۆی خۆشەویست دەکەم، کە هەوڵی ئەوەتدا کە کتێبەکەم بخوێنیتەوە، وە منیش گەیشتمە کۆتای ئەم کتێبە، سوپاسی خودا دەکەم کە پالپشتم بووە لە نوسینی ئەم کتێبەدا، چونکە بە یارمەتی پەروەردگارم نەبووایە من هەرگیز نەدەگەیشتمە ئەم قۆناغە. من لە نوسینی ئەم کتێبەدا ئامانجم سوود پێگەیاندنبووە بە خەڵکی و چاک کردنی بەشێکی زۆر کەمی هەڵەی کۆمەڵگاکەمان. ئەگەر تەنها کەسێک بتوانێت سوودێک ببینێت بە بۆنەی ئەم کتێبەوە ئەوا من پەشیمان نیم لەوەی کە خۆمم ماندوو کردووە لە نوسینی ئەم کتێبەدا، کە شەوانی واهەبووە ئەوەندە خەریک بوومە چاوم فرمێسکی پێدا هاتووەتە خوارەوە، یان جاری وابووە تا چواری بەیانی من خەریکی کۆمپیوتەرەکەم بوومە، بۆ ئەوەی بتوانم بابەتێکی گونجا و باش ئامادە بکەم، بۆ تۆی خۆشەویست. ئەمەی تۆ دەیبینیت ئەوەندە ئاسان دروست نەبووە، چەندین ڕێگری لە ژیانم هەبووە، سەختی زۆرم دیوە، هیلاکەتی زۆرم چەشتوە. ئەوەی ئێمە مەبەستمانە (إن شاء الله) دەبێتە ڕووناکیەک بۆمان

بۆ قیامەتمان.

ئەوەی کە منی زیاتر هاندا بۆ تەواوکرنی ئەم کتێبە پشت بەستنێکی زۆر بوو بە خودا، پاشان متمانە بە خۆبوون، من متمانەیەکی زۆرم بە خۆم هەبوو کە دەتوانم، من لە سەرەتا بەو شێوە بیرم نەکردەوە بلێم: باشە من چۆن دەتوانم؟! من کوا ئەو هێز و توانایەم هەیە؟! من کەی دەتوانم؟! نا بەڵکو من وتم: هەر دەتوانم چونکە پێش منیش چەندین کەس توانیویەتی کتێبێکی وا بنوسێت، بۆیە منیش دەتوانم و هەر سەردەکەوم، هەمیشە دەم وتت بە پشتیوانی خودا دەتوانم و سەردەکەوم. هیوام وایە هەر کەسێک ئەم کتێبەی خوێندبێتەوە سوودێکی باشی پێ گەیاندبێت، هەرچەندە کەمیش بێت، ئەوەی زیاد گرنگ بێت لای من، خودا ئاگاداری نیەتی دڵمانە کە چی بە خوێن و خەیاڵمان دا دڕوات، {وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ} بەو هیوایەم کە وشە بە وشە سوودی بە تۆیی ئازیز گەیاندبێت و ببێتە هۆیی چاک کردنی هەڵەیەکت، یاخود وەرگرتنی زانیاریەک. لە کۆتایدا سوپاسی ئێوە دەکەم بۆ خوێندنەوەی کتێبەکەم. لە ئایندەدا چاوەڕێی بەشی دووی کتێبەکە بن، یاخود کتێبێکی تر کە بە زاری ئێمە بنوسرێت، گەر تەمەن باقیبێت و خودا ویستی لێبێت.